# خوێندنەوەیەکی تر بۆ
# بیری سیاسیی
# شێخ ڕەزای تاڵەبانی

مامۆستا جەعفەر

لەشیعرەکانی شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا، دوو جیهانی پارادۆکس بەدیدەکرێت: پیاوێکی ڕەوانبێژ، زیرەک، هۆشیار، بەئاگا، زمانهەراش، قسەسوار، ڕاکێشەری سەرنجی ناو کۆڕو کۆمەڵ بۆ شێوەی دوانو داڕشتنی خۆی. ئەمە دیوێکی کەسایەتی شاعیرە، دیوەکەی تری ئەوەیە، نزمترینو پیسترینو درێوترینو بازاڕیترینو سووکترین جوێن، لەبازاڕەوە بۆ ستركتوورو بینای قەسیدەی کلاسیکی هەڵدەبژێرێت. ئیدی ئەوەی (حەیا)و (حورمەت)و شەرمو شکۆو (تابوو Tabu) بێت، لەناو (ئەدەب)ەکەیدا بەرچاو ناکەوێت.

کەواتە: هۆی چییە شێخ ڕەزا، کە لەناو خێزانێکی ئاینی گەورەو بەڕێز، پەروەردە کراوە، کەچی ئەو، وەکو کارو پیشە تا دوا ڕۆژەکانی ژیانی، دەستبەرداری تەکیەو مزگەوتو شەریعەتو کاری ئاینی نابێت، لەهەمان کاتدا، هەر لەتەمەنی گەنجێتی تا دواڕۆژەکانی ژیانی، دەستی لە (هونەر)ی داشۆریو ساتیرو داپاچین هەڵناگرێت؟

ئایا قەسیدەی (لەبیرم دێ..) دەکرێت، بەسەرەتاو پێشەنگی شیعری ناسیۆنالیستی کوردی دابنرێت، یان ئەو (بیری سیاسی) بەئەفسانەو داری بێبەر داناوەو هەر شەیداو پەروانەی بەرژەوەندییە تایبەتو بەرتەسکەکانی خۆی بووەو هەر ڕۆژەی لەئاشێکی کردووەو هەر ڕۆژەی لەشوێنێکماڵیویەتیەوە؟

## میتۆدی کارو لێکۆڵینەوە

بۆ تێگەیشتنی بیری سیاسیو جیهانبینیو ئاسۆی بیرکردنەوەی شێخ ڕەزا، ئێمە ناتوانین تەنیا پشت بەشیکردنەوەو لێکدانەوەی شیعرەکانی ببەستین، بەڵکو دەبێ شیعرەکانی بۆ تانو پۆو کۆنتێکستی Context کۆمەڵایەتیو سیاسیو فەرهەنگیو سیاسی ناوەڕاستی سەدەی (١٩) تا ساڵی ١٩١٠ بگێڕدرێتەوە.

ئەگەر پرسیاری سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیە، پەیکەرێکی شاراوەی بنگڵکەوتووی شوێنەوار بێتو شوێنەکەی بۆ تیمی کۆڵیارو پشکنەر، بەوردی دەستنیشان نەکرابێت، دەبێ لەچوارلاوە، بەزنجیرەی پاچی پرسیار، ڕووەو شوێنی خەملێنراو، پاچەکان بۆ بن زەوی لەگەڕدابنو چین چین، دوای شوێن دیوارو خشتو لەتە گۆزە بکەون، تا لەپەیکەرەکە نزیک دەبنەوە...

ئێمە پێویستە، ئەم خاڵانەی خوارەوە، بەوردی ڕەچاو بکەین:

١. لەڕووی کاتو سەردەمەوە، ئەو لەئێمەوە زۆر نزیکترە، لەچاو بابا تاهیری هەمەدانیو مەلا پەرێشانو مەلای جزیری. زۆر کەس لەوانەی شێخ ڕەزایان بینیبوو، تا نزیکەی ٣٥ ٤٠ ساڵ لەمەوپێش لەژیاندا بوون بۆ نموونە: ڕابیعە خانی کچی شاعیر (...... ١٩٧٤). ئەم نەوەیە، ئێستا کەسیان نەماون، بەڵام نەوەیەک لەژیاندان، کە چاویان بەنەوەی پێشوو کەوتووە، لەوانەوە کۆمەڵێک زانیاریو دەنگوباسیان لایە، شایانی تۆمارکردنو بەدۆکۆمێنتکردنە، بۆ نموونە: د. موکەڕەم تاڵەبانی[1]و د. نوری تاڵەبانی[2]و ... هتد.

٢. شێخ بەپێچەوانەی مەولەویو وەفایی، هیچ نامەو بیرەوەری دوای خۆی بۆمان جێنەهێشتووە،[3] بەلای کەمەوە بەرچاوی خوێنەران نەکەوتوون، ئەم کەلێنە، بارگرانیو یارمەتینەدەرە بۆ تێگەیشتنی باشتری ژیانو بەرهەمەکانی شاعیر.

٣. بەشی زۆری شیعرەکانی شێخ ڕەزا نەماون، یان دەستێک ڕێگەی بڵاوبوونەوەیان دەگرێت. وا باوە، ئەو خۆی، تاقەتی نووسینەوەو کۆکردنەوەی شیعرەکانی نەبووە، لەئامێزی دیوانێکی ڕێکو پێکدا. مێجەرسۆن چاوی بەشێخ ڕەزا کەوتووەو لەدەفتەرێکی دەسنووسدا هەندێ شیعری بۆ خوێندۆتەوە، ئەم دەفتەرە، هیچ دەنگوباسێکی نییە.[4] هەرچی شیعری بڵاوکراوەیشی هەیە، ڕەنگە لەڕێگەی خەملاندنو بەراوردەوە، بزانرێت کەی نووسراونو بۆنەکەیان چییەو مۆتیڤی نووسینی شیعرەکانی لەکوێوە سەرچاوە دەگرن؟

٤. چەند کەسێک لەدۆستو هاوچەرخەکانی شاعیر وەکو (ئەمین فەیزی)، خاوەن کتێبی: (ئەنجومەنی ئەدیبان)[5]و ئینال (ا. مەحموود کەمال) خاوەن کتێبی: (صوک و عصر تورک شاعرلری)[6] بەکورتی لەسەر شێخ ڕەزایان نووسیووە، سەرنجو تێبینییەکانیان زۆر گرنگنو بریا تۆزێک زیاتریان دەنووسی.

٥. باوکو باپیرەو مامو براو خزمو کەسوکاری شێخ ڕەزا، کەسانی بەناوبانگو ناسراون، هەریەکەیان، یان بەرهەمو شیعرو نووسینیان لەدوا بەجێماوە، یان زانیاریمان کەمو زۆر لەسەریان هەیە، بەشێک لەو زانیاریانە، بۆ هەندێ قۆناغەکانی پرۆژەی لێکۆڵینەوە، بەسوودو پێویستنو یارمەتیمان دەدەن، بە بەراوردو بەراوردکاری، هەندێ ئەنجامی باشمان دەست بکەوێت.

٦. ماڵەکەی شێخ ڕەزا، ڕەنگە تاقە ماڵی شاعیرێکی کورد بێت، پاش تێپەڕبوونی پتر لەسەدەو نیوێک بەسەر دروستکردنیدا، هێشتا وەکو خۆی مابێتەوە، هەقە حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئەم ماڵە وەکو بەشێک لەشوێنەوار بپارێزێتو بەرە بەرە، بەجوانی ڕێکبخرێتەوە وەکو مۆزەخانە، یان بەشێک لەژینگەی شاعیر، دەرگای بۆ بینەران لەسەر پشت بێت، پارێزگای کەرکوک، یان شارەوانی، دەتوانێت بەهەمان کار هەڵبستێتو ئەم شوێنەمان لەدەست وێرانبوون بۆ بپارێزێت.

٧. نووسینەکەی من، تەنیا یەک تەوەرو یەک لایەن، لەشیعرەکانی شێخ ڕەزا دەخاتە بازنەی لێکۆڵینەوەو شیکارییەوە، واتە: لایەنی سیاسی، هەرچەند من خۆم چاک ئەو ڕاستییە دەزانم، مامە شێخ ئەوەندەی بەهونەری داشۆریو ئاگرباران ناوی ڕۆیشتووە، یەک لە دەی ئەوەش ناوی بە شاعیری بیری سیاسیو

هەڵوێستو جیهانبینی نەتەوەیی ناوبانگی دەرنەکردووە. ئێمە تەوەری هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیو ژیانی تایبەت، بەدەرەوەی بازنەی کارەکەمان تێدەگەین، هەر بایی ئەوەش ئاماژەی بۆ دەکەینو لەسەری دەنووسین، تێگەیشتنی کارەکەمان بۆ ئاسانتر بکاتەوە، لەکاتی دارەڕاو سەربانگرتندا، بەبێ کۆڵەکەی قایم، یان کاریتەی ئەستوور، هەر زۆر زەحمەتە بانیژەکە خۆی ڕابگرێت.

من بەڕاشکاوانە، سەبارەت ئەو هەموو قەسیدە پڕ لەوێنەی ئیرۆتیکی، وورووژێنەر، ڕێگە پێنەدراو لەرووی کۆمەڵایەتییەوە، کە ئەمسەرو ئەوسەری دیوانەکەیان تەنیوەتەوەو شایانی ئاوڕلێدانەوەو لەسەر نووسینن، لەلایەن کەسانی پسپۆڕی بواری دەروونناسیو شیکردنەوەی دەروونی. کردنەوەی کۆدەکان، کاری دەروونناسانە، یەکێک بیەوێت ((جوێن))ەکان وەکو جوێنی ڕووت تێبگات، ئەوە زیان بەئەدەبی کوردی دەگەیەنێت.

## خاڵس

شێخ ڕەزا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان (خالس)ی تاڵەبانییە(٧) (١٢١٢- ١٢٧٥ ک) بەرامبەر (١٧٩٩- ١٨٥٩ ز) پاش مردنی باوکی، شێخ ئەحمەدی تاڵەبانی، دەبێتە مورشدی ڕێبازی قادری، شاعیرێکی مەزنو سۆفییەکی بەناوبانگە، لەسەردەمی خۆیدا بە غەوزی دووەم (غوث الثانی) ناوی ڕۆیشتووە، لەگوندی (تاڵەبان) ەوە بۆ شاری کەرکوک ماڵ دەگوێزێتەوە، ساڵی ١٢٦٠ ک بەرامبەر (١٨٤٢- ١٨٤٣ ز) تەکیەی تاڵەبانی لەوێ دروست دەکات، دە براکەی تری هەریەکە بۆ شوێنێک دەڕۆنو ڕێبازی تاڵەبانی لەوشوێنانەدا بڵاودەکەنەوە، بۆ نموونە: شێخ غەفووری برای بۆ کۆیە دەچێتو لەوێ نیشتەجێ دەبێت.

خاڵس لەگەڵ شێخ عوسمانی سراج الدینی نەقشبەندی تەوێڵە، پەیوەندییەکی توندو تۆڵی هەبووە، بەهەمان شێوە، دۆستایەتی مەولەویو خاڵس زۆر بەهێزبووەو مەولەوی سەردانی کردووە.(٨)

شێخ عەبدولڕەحمان چوار ژنی هێناوە. لەم چوارژنە، چوار کوڕی هەبووە:

١- شێخ عەلی (١٨٣٢- ١٩١١)(٩)

٢- شێخ عەبدولقادر (١٨٣٤- ١٨٩٧)

٣- شێخ عەبدولواحید (١٨٣٦ ؟)(١٠)

٤- شێخ ڕەزا (١٨٣٨- ١٩١٠)

## سەردەمی منداڵی

سەبارەت بەسەردەمی ژیانی منداڵیی شاعیر، ئێمە هەر یەکجار زۆر کەم دەزانین. جیاوازییەکی زۆر لەسەر ساڵی لەدایکبوونی شاعیر هەیە، زۆربەیان لەسەر ساڵی ١٢٥٤ ک بەرامبەر ساڵی (١٨٣٨ ز) کۆکن. د. موکەڕەم تاڵەبانی لەکتێبی (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) ساڵی ١٢٥٣ ک داناوە، پاشان لەدانیشتنێکدا گوتی:"باپیرەم شێخ حەمەعەلی، کە برازای شێخ ڕەزایە، ساڵی ١٢٧٣ ک بەرامبەر ساڵی ١٨٥٧ ز لەدایکبووەو نێوانیان (١٩) ساڵ بووە. کەواتە: ساڵی ١٢٥٣ ک هەڵەیە"(١١)

لەوەدەچێت ژیانی شێخ عەبدولڕەحمان، پێش ئەوەی لە کەرکوک بەیەکجاری جێگیربێت، لەگوندێکەوە بۆ گوندێکی تر ماڵی گواستبێتەوە: سەرەتا لەتاڵەبان بووە. شێخ ڕەزا لە (قرخ) ی ناوچەی بازیان لەدایکبووەو لەوێوە بۆماوەی ساڵێک لەگوندی (ساری تەپە) بوونو پاش ساڵێک، بەیەکجاری ماڵی بۆ کەرکوک گواستۆتەوە، یەک ساڵیش لەشاری سنە بۆ خوێندن ماوەتەوە..

جگە لەگواستنەوە لەگوندێکەوە بۆ گوندێکی تر، شێخ ڕەزا لەتەمەنی پێنج شەش ساڵیدا سەفەرێکی ئەفسووناوی بۆ شاری سلێمانی دەکاتو دیمەنەکەی ئەوەندە بەلاوە سەیردەبێت، قەت بیری ناچێتەوە:

کە عەبدوڵڵا پاشا لەشکری والیی سنەی شڕکرد

(ڕەزا) ئەو وەختە عومری پێنج شەش توفڵی دەبستان بوو(١٢)

ئەم هەموو ماڵ گواستنەوەو گەڕانە، کاریگەری خۆی لەسەر پێکهاتنی کەسایەتی شاعیر هەبووە، لەکاتی گەنجێتیدا ئیدی خۆی بڕیاریدا چەندین جار سەفەری کۆیەو ئەستەمووڵو بەغداو.. هتد. بکات.

شێخ ڕەزا چوار زمانی بەچاکی زانیوەو شەڕە شیعری پێکردوون (کوردی، عەرەبی، فارسی، تورکی)، فێربوونی چوار زمان کارێکی ئاسان نییەو بەڵگەی ئەوەیە، ئەوکاتەی ئەم (پێنج شەشساڵ) بووەو (طفلی دبستان) بووە، مامۆستاکانی مامۆستای زیرەکو زانا بوون (شێخ عەبدولڕەحمان، شێخ غەفووری تاڵەبانی، مەلا محەمەدی ئابڵاخ،.. هتد.) پرۆسەی (سۆسیالیزاتسیۆن[١٣] (socialization) لەسێبەری خاڵسیدا، بەچەشنێک بووە، لەچوار مناڵ سیانیان شاعیرو زانای ئاینی گەورەبوون.

ئێمە لەژیاننامەی شێخ ڕەزادا، بەئاسانی بۆمان دەردەکەوێت، ئەم چوار زمانەی بەباشی زانیوەو لەتەمەنی (٢١) ساڵیدا، پەلاماری کەڵە شاعیرانی داوەو[١٤] ئازاری پێگەیاندوون. لەتەمەنی (١٩) ساڵیدا رووی کردۆتە ئەستەمووڵو گەشتوگوزاری پایتەختی کردووەو تێکەڵاوی کۆڕی شاعیرانو ئەدەب دۆستان بووە.

زۆربەی مێژوونووسان تێبینی خاڵێکیان لەژیانی شێخ ڕەزادا نەکردووە: ئەو بەکام دیالێکتی کوردی لەماڵەوە دوواوە؟

من لەپیاوێکی رووناکبیرو بەئاگام بیستووە، بەبیرەوەری ئەو، تا ماڵی باپیرەی مابوون، هەر بە شێوەزاری گۆرانی دەدوان، پاش باپیرە، دەستبەرداری شێوەی گۆرانی بوون، واتە: تا سەرەتای چلەکانی سەدەی پێشوو.[١٥] من هەمان پرسیارم لە د. موکەرەم تاڵەبانی کرد، ئەو پێیوابوو، تا شێخ عەلی لەژیاندا بووە، بەشێوەی زەنگنە قسەکراوە. شێخانی تاڵەبانی هەموو شێوەی زەنگنەیان دەزانی، تا ئەم دواییەش ئاغایەکی زەنگنە سەردانی بکردینایە لەناو یەکتردا، هەر بەگۆرانی شێوەی زەنگنە پێکەوە قسەیان دەکرد.[١٦]

گومان لەوەدا نییە، حەزرەتی شێخ گۆرانییەکی چاکی زانیوە. شێخ عەبدولڕەحمان بەشێک لەشیعرەکانی فارسینو بەشەکەیتر بەشێوەی گۆرانیو لەوەڵامی مەولەویدا دەڵێت:

ئیرادەم ئێدەن، وەی کەڵپۆسەوە
شەو ناڵین وەشەن، وەلای دۆسەوە[١٧]

سەیر ئەوەیە شێخ ڕەزا هەموو شیعرە بڵاوکراوەکانی بەشێوەی سۆرانی (کرمانجی خواروو) نووسراون، تەنیا قەسیدەیەکی هەجو نەبێت، کە ئاڕاستەی پیرۆزەی کچی حەسەن کەنۆشی دەلۆ کراوە:

((حەسەن کەنۆشن، ئینە کەناچەی حەسەن کەنۆشەن))

کەچی پیرۆزە خانم، بەشێوەی سۆرانی وەڵامی داوەتەوە. ئەوەی ئەو بەشێخی کردووە، نە سەرما بەهەتیوو، نە ڕەشەبا بەدەواری شڕی کردووە:

رەزا وەزەفتم.. ڕەزا وەزەفتم
هیچ کەس نەکەردن تەعەدا زەفتم
دەمتو مابەین چاڵی ئەشکەفتم
بچی وەچاوتا بەلوکەی چەفتم[١٨]

## ژینگەی بەر تەکیە

ئێمە بۆئەوەی (وێنا)یەکی دوور لەئەفسانەو زانستیمان لەسەر دروستبوونی گەنجینەی فەرهەنگیان لەسەر شێخ ڕەزا لادروست ببێت، بەپێویستی دەزانم، ژینگەی ئەو لەگەڵ ژینگەی چەند شاعیرێکدا بەراورد بکەین: بۆ نموونە (هێمن)ی موکریانی: ئەو ڕووبارێک وشەی هێنایە ناو شیعری کوردییەوە، ئەگەر ئەو لە (شیلان ئاوی) پەروەردە نەبوایە، ڕەنگە نەیتوانیبایە هیچ هەستێکی بەرامبەر بەوشەکان هەبوایە، یان لەبەکارهێنانیان چێژ وەربگرێت..

شێخ ڕەزا، ئەگەر دوو کارێکتەری ناکۆکو دژ بەیەکی هەبێت، ئەوە یەکێکیان بەرهەمی تەکیەیەو ئەویتریان بەرهەمی بەر تەکیە!

پێویستە کۆمەڵناسە کوردەکان، لەسەر کولتوورو ژینگەی هەندێ گەڕەکی شار، لێکۆڵینەوەی خۆیان بکەن، هەر بۆ نموونە: کاریگەرێتی دروستکردنی مزگەوتێک، تەکیەیەک، خانەقایەک لەسەر گەڕەکێک چییە؟ ئەو خەڵکە هەموو ڕوودەکەنە نوێژو خواپەرستی، یان بەپێچەوانەوە، لەدەوروبەری ئەو مزگەوتە، ژینگەیەکی زۆر تایبەت دروست دەبێت، لەدووبارە بوونەوەو هاوشێوەیەتی، لەڕووی پێکهاتەوە، ژینگەی کۆمەڵایەتییەوە، لەگەڵ (خانەقا)و (بەرخانەقا)ی شاری سلێمانی، هەندێک لێکچوونو جیاوازی هەیە!

جیهانی ناو تەکیە: نوێژو خوێندنو فێربوونو ئیرشادو دەفلێدانو موناجاتو ئەڵقەی زیکرو یاهوو.. یاهوو.. بووە. (بەرتەکیە) جیهانێکی جیاوازو جەنجاڵ بووە، جیهانی ناو تەکیەو بەرتەکیە، تەنیا وشەی (تەکیە) هەردووکیان کۆدەکاتەوە، هەرچەند لەڕووی جوگرافییەوە سەیری بکەین، لەیەکەوە نزیکنو بەدەم یەکەوەنو هاتوچۆو پەیوەندیو ڕایەڵ، لەنێوان ئەم دوو جەمسەرەدا هەیە، دەشکرێ لەنێوان، هێڵە هاوتەریبو بەرامبەرەکان، چەندین یەکتربڕینو تێهەڵکێش هەبێت، دیاردەی ژینگەی بەرتەکیە، جۆرێکە لەرەنگدانەوەی لاوەکی کۆمەڵی ئەوسای کەرکوک، کەسانی پەڕیوەو دەروێشو ئاوارەو بێکەسوکارو بێشوێنو بێدەرەتان، بەحوکمی خۆپاراستنو خۆژیاندن، هەروەکو چۆن لەترسی خنکانو لافاوو تۆفان (کەشتی نووح) دەستی هیوای پێوەگیراوە، ئەوانیش دەستیان بەدەرگای تەکیەوە گرتووە، تا دەروویەکیان لێدەکرێتەوە.

د. موکەڕەم تاڵەبانی دەنووسێت: ((دانیشتوانی بەرتەکیە، لەرەسەندا هەموو کوردن، بەڵام هەریەکە لەهەرێمێکی کوردستانەوە هاتوون، وەکو قالە تەنیایی، ئەمین سووورداشی، سلێمان چاووش، ئەحمەد مەلاژن، سەید ئەمین هەپلوس، حەمەی وەستا فەتاح، بلە منگن، ... هتد))[١٩] زۆر جێگەی داخە، کە ئێمە پەیوەندی شێخ بەم کەسایەتییانەوە نازانین، جگە لە (حەمەی وەستا فەتاح)[٢٠] کە شێخ ڕەزا بە (موفیدو موختەسەر) هەجوێکی کردووە، تا ئەمڕۆش زۆر کەس لەبەریەتیو بەهۆیەوە ناوی لەدیوانی شاعیرێکدا پارێزراوە.

ڕاستییەکی ڕوونە، خاڵس ویستویەتی کوڕەکەی بەجوانترینو باشترین شێوە پەروەردە بکات. ئەو، هەلومەرجی فێربوونی بۆ فەراهەم کردووەو ڕەوانەی لای باشترین مەلاو زانای کردووە بۆ قووڵبوونەوە لەبواری فیقهو شەرعو زمانی عەرەبیو فارسیو عوسمانیو تەسەوف... هتد. ئاشکرایە کوڕ، زۆر شتی لەباوکی وەرگرتووەو تا دوا ڕۆژی ژیانی، دەستی لەڕێگەی باوکی بەرنەداوە.

باوک، بەگوێرەی کاتو توانای خۆی، هەوڵێکی زۆری لەگەڵ کوڕە بچووکەکەی داوە، هیچ نەبێ لەسێبەری خۆیو بنەماڵەدا، گەشە بکاتو سەرکەوتن وەدەست بهێنێت.

ئێمە ئەگەر زانیمان، کاتێک شێخ ڕەزا لەدایکبووە، باوکی ئەوکاتە تەمەنی دەوروبەری (٣٨) ساڵ بووە، دیارە ئەو بایەخپێدانو یاری لەگەڵکردنو دەست بەسەرداهێنانەی بەر شێخ عەلی واتە: کوڕی نۆبەرەکەی کەوتووە، ڕەنگە ٢٠٪ بەر شێخ ڕەزا نەکەوتبێت. جیاوازی تەمەنی کوڕەکان، دووساڵ، دووساڵە، چوار منداڵی بچووک، ڕەنگە هەرچواریان پێکەوە ویستبێتیان ئاو بخۆنەوەو بنوونو لەسەریان بێنە خوارەوە، باوک ئەگەر بۆ نۆبەرە، ئەوپەڕی شادیو بەختەوەری نواندبێت، بۆ دوا منداڵ، تاقەتی نەبووە، هەمان خۆشەویستی پێشکەش بکات.

## منداڵی گەورەکراو

لەکۆمەڵی دەرەبەگایەتیدا، منداڵ ئاسۆی هەڵبژاردنی کارو پیشە، لەبەردەمیدا نەبووە، پیشە، لەباوکەوە بۆ کوڕ بەمیرات ماوەتەوە، تێڕوانینی ئەوان بۆ (منداڵ)، هەمان تێڕوانینی ئەمڕۆ نییە، لای ئەوان منداڵ پیاوێک، یان ژنێکی بچووکە، کەسانی خانەدان بۆ منداڵی بچووک، کوڕێکی حەوت هەشت ساڵان، جلوبەرگی گەورەیان لەبەرکردووە.

هێمنی شاعیر (١٩٢١-١٩٨٦) ئەزموونی خۆی لەگەڵ ئەزموونی کۆن، بەم شێوەیەی خوارەوە دەگێڕێتەوە:
((ڕێو شوێنی بنەماڵەکەمان ئیجازەی نەدەدا من لەگەڵ هاوتەمەنەکانم گاڵتەوگەپ بکەم، چونکە من کوڕە دەوڵەمەند بوومو ئەوان کوڕە هەژار. من کوڕی شێخولئیسلامی بەناوبانگ بووم، ئەوان کوڕی لادێییەکی بێناوو نیشان، من بەروپشت ئەتڵەس بوومو ئەوان کەڕە کرمانج، من کۆکو پۆشتە بوومو ئەوان ڕووتو ڕەجاڵ.

ئاخ... گەورەکانم تێنەدەگەیشتن من چەند پەرێشانو کەلەلام، ئەوان نەیاندەزانی بەو کردەوەی خۆیان چۆن هەستی من بریندار دەکەن، برینێک کە دەبێتە گریمانەی ڕووحیو تامردن سارێژ نابێ.

ئێستاش کە وەبیرم دێتەوە، کزەم لەجەرگی دێو خەمێکی گران دامدەگرێ، کە من لەهەموو خۆشی سەردەمی منداڵی بێبەش بووم، لەپێش چاوی من، منداڵەکانی گوندەکەمان، ئەو ڕەشو ڕووتانەی هاوشانی من نەبوون! بەئازادیو بێباکی گاڵتەوگەمەیان دەکرد، لەخاکو خۆڵ دەگەوزین، لەسەربانان هەڵدەبەزین، لەقوڕو چڵپاودا غارغارێنیان دەکرد، لەسەر تەپۆلکو کۆپەین ملانەیان دەگرت، لەسەر سەهۆڵ خلیسکیان دەکرد، لەسەر لۆدە کا بازبازێنیان دەکرد، بەگژیەکدا دەچوون، پێکهەڵدەپرژان، ئاشت دەبوونەوە، ئاورۆچکەیان دەکردەوەو خانووچکەیان دروست دەکرد، هێلانە چۆلەکەیان دەردەهێنا، تەبکەیان دەناوە، هەلووکێن، تۆپێن، هەمزەل، هەنگڵە شەلە، دایە من مەدە بەگورگی، هەڵوای بەشەپان، قەرەقەریو دەیان جۆرە گاڵتەی دیکەیان دەکرد. بەڵام من بەو تاوانەی کە نەجیب زادە بووم، دەبوو وەکو گەورە گەوران لەدیوەخان لەسەر چۆک دابنیشمو متەقم لەبەر نەیەتە دەر! بۆ بەدبەختی، لەماڵی ئێمەدا نێرینەی لەمن بچووکتر نەبوو، دەبوو لەبەر هەموویان یەک پێ هەستمو تا ئیزنم نەدەن لەبەر دەستیان ڕاوەستمو دانەنیشم، لەدوای هەمووان نانو چام بۆ دابنێن، چەندم پێخۆش بوو نە کەوای مەخمەرو تاقەو قوتنیو خەزەلم لەبەردابا، نە پانتۆڵی ئاڵمانی زەردم لەپێدابا، نەکاڵەی شەمامەبەندی ئاوریشمچنم لەپێداباو نە شەدەی سەوزم لەسەرباو نە پشتێنی پەشمینەی کەسکم لەپشدا باو وەک منداڵە ڕووتەڵانەکان ئازاد بام)).[٢١]

## فەرهەنگی زمانەوانی بەرتەکیە

من هەر لەسەرەتاوە دانم بەدوو ڕاستیدا ناوە:

١. دەربارەی سەردەمی منداڵی شێخ ڕەزا، نەخۆی هیچ شتێکی ئەوتۆی بۆ جێهێشتووین، کە بۆ لێکدانەوەو بەراوردکردن یارمەتیمان بدات، نەکەسێکی هاوچەرخی شاعیر، شتێکی نووسیووە لەسەر فەرهەنگی زمانو ژینگەو کولتووری ئەوێ.

٢. من هیچ شارەزاییەکی ئەوتۆم لەبورای دەروونناسیدا نییە، ژمارەیەک ((جوێن))و ((وێنە))ی ئیرۆتیکی، پێویستە بەمیکرۆسکۆپی دەروونناسێک، شیبکرێنەوەو دەرهاویشتەی (لابورر Labur) بەتەنیشت یەکترەوە دانرێت.

بێگومان شاعیر بەرێکەوت، وشە بۆ ناو بینای قەسیدەیەک هەڵناپرژێنێت، ئەو وشەکان، هەر زۆر وەستایانە، هەڵدەبژێرێتو بۆ هەڵچنینی دیواری تەلاری قەسیدەکە ژیرانە بەکاریان دەهێنێت.

هەرکەس چاوێکی خێرای بەدیوانی شێخ ڕەزادا گێڕابێت، یەکسەر ئەو ڕاستیە دەزانێت (فەرهەنگی ئەشعاری شێخ ڕەزا)[٢٢] هەر زۆر لە (فەرهەنگی ئەشعاری شاعیرە کلاسیکیەکان) جیاوازە، ئەوان ویستویانە پێڕەوی حافزی شیرازیو جەلال الدینی ڕوومیو سەعدیو ئەنوەری.. هتد بکەن. تەکنیکی شیعری کلاسیکی[٢٣]و

((سبک))ی شاعیرانی ئەو ڕێبازە ئاشناو زانراوە، شێخ ڕەزا ئەو کاتەی نازناوی (لامع)، ماوەیەکیش (ڕەزا) بووە، بەوردی لەسەر ڕێبازی شیعری کلاسیکی ڕۆیشتووەو چەند غەزەلێکی هەیە، کە هەمووی ئیلتزامکردنە بە بنەماکانی شیعری کلاسیکییەوە:

ڕۆژێ نەبوو ئەم دلبەرە بێ ڕەحمە وەفاکا
جارێ نەبوو ئەم کافرە شەرمێ لەخوداکا

* * *

ڕۆح‌و، دڵ‌و، دین هەرسیە دەکەم بەژڵ‌و نیاری
کامی دڵی من گەر لەلەبی لەعلی ڕەواکا

* * *

سەردانی لەڕێی عەشق (رەچا) لازمە عاشق
بۆ یار سەرو ماڵی سوپەری تیری قەچاکا[٢٤]

ئەمە نموونەی شیعری کلاسیکی شاعیرە، پاش ساڵانی (١٨٥٩-١٨٦٠ز)، قۆناغی کلاسیکی وەکو شێوەی دەرەوە، پارێزگاری کراوە، بەڵام مەبەستو ناوەڕۆکی ئاڕاستەیەکی زۆر جیاوازی هەیە.

## شێخ ڕەزا بەکام زمان نووسیویەتی؟

زمان ئەگەر بە ئاسۆیی سەیری بکەین، بەسەر چەندین دیالێکتو بن دیالێکتدا دابەش دەبێت، ستوونی سەیری بکەین، هەر چینو گروپێکی کۆمەڵایەتی، شێوەی تایبەتی خۆیان هەیە، بۆ نموونە:

زمانی ئەڵەمانی بەگشتی سێ چینە:

١. زمانی ئەدەبو چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵ
٢. زمانی ئاسایی کۆمەڵانی خەڵک
٣. زمانی خواری خوارەوەی کۆمەڵ

ڕوونکردنەوەی ئەم سێ زمانە کارێکی ئاسان نییە، بەکورتی دەتوانم ئەوە بنووسم، ئەم سێ زمانە، لەڕووی وشەسازیو فەرهەنگو دەستەواژەو ڕستە سازییەوە، زۆر لەیەکەوە جیاوازن، بۆ نموونە: بەرامبەر بەوشەی ئاودەستی کوردی، چینی یەکەم، زاراوەی ((توالێت)) بەکاردەهێنێت، دووەم دەڵێت ((کلۆ Klo))، سێیەم پێیدەڵێت: ((شایسهاوس ماڵە گوو))..

بەرامبەر بەچینی خواری خوارەوەی کۆمەڵ، کورتە ڕوونکردنەوەیەک پێویستە: لەوێ چەمکی ((لومپنپرۆلیتاریات Lumpenprolitariat)) لەفەرهەنگی سیاسیدا بەکاردێت، ئەگەر بەحەرفی تەرجومە بکرێت، ڕەنگە ((شرە پرۆلیتاریا)) ڕێک پڕ پێستی بێت، لەزمانی بازاڕی کوردیدا چەندین زاراوەی وەکو: ((چڵێتو پڵێت))و ((چەکلو پەکل))و ((چەورەو مەورە)) هەبێت، من بۆ خۆم بەرامبەر ئەم گروپە کۆمەڵایەتییە ناتوانم لێرەدا، لەمە زیاتر بنووسم.

ئەوی ڕاستی بێت، ئەو جوێنو قسە ناشرینانەی لەو گۆشەو جغزەی کۆمەڵەوە بەرگوێ دەکەون، لەهیچ فەرهەنگ ((قاموس)) ێکدا بەرچاو ناکەون.

شێخ ڕەزا، بەزانستو خوێندەواری بێت، کوڕی قۆناغی کلاسیکەو هەرچی کتێبی زانیاری ئایینیو ئەدەبی بێت، خوێندویەتیو لەبینای قەسیدەدا بەکاریهێناون، ئەوەی ناسروشتییە، لەچینو گروپە پەراوێزخراوەکانی کەناری کۆمەڵەوە، ئەو بەقەرز ڕووبارێک وشەی بازاڕیو دزێوی وەرگرتووەو بێپەروا بەکاریهێناونو هیچ گوێی بەقەدەغەو شەرمو لەڕوونەهاتنو عەیبەو نابێو ناشێو تابوو Tabu نەداوە.

مەعلومە شێخ ڕەزا، لەبەردەستی باوکیو مامیو مەلا ئەسعەدی جەلیزادەو مەلا محەمەدی ئابلاخ، فێری زانیاری ئایینیو لاهوتیو زمانەوانی بووە، ئەی ئەو هەموو داشۆریو شەڕە جوێنە لەکام فێرگەو خوێندنگەو زانکۆ فێربووە؟

لەئاسمانەوە ئیلهامی بۆ نەهاتووەو لەکتێب خوێندنو گوێگرتن لەمامۆستا ئەم هونەرە فێر نەبووە؟! ئەدی دەبێ لەکام سەرچاوەوە، قەریحەی شیعر هۆنینەوەی کرابێتەوە، بەچەشنێک، هیچ سوارێکی مەیدانی داشۆری، بەتۆزی ناڵی سمی ئەسپەکەیدا نەگات؟

من ئەگەر سیگمۆند فرۆید، یان کورت ئایسلەر[٢٥]، یان یونگ بام، ڕێگەم بەخۆم دەدا، چوار قسە لەسەر بابەتەکە بنووسم، بەڵام من ئەوان نیمو لەم بوارەدا نامەوێ ئیدیعای پسپۆڕیو شارەزایی بکەم، ڕێگە بەخۆم نادەم، لەبازنەیەکی بەرتەسکدا نەبێت، جڵەوی ئەسپی سەرکێشی قەڵەم شل بکەمەوە. لەپێناوی بەراوردکاریدا ئەبو نەواس (ابو نواس)[٢٦] وەکو نموونە دەهێنمەوە، ئەو لەخوێندنی زانکۆ فێری هونەری (خمریات، غزلو .. هتد.) نەبووە، ئەزموونی تاڵی ژیان، تێکشکانی دەروونی، سووکایەتی پێکردن، ئەویان بۆ (جیهانێکی جیاواز) پاڵناو تێیان گەیاند، ئەو بەهۆی جیاوازی نێوان عەرەبو فارس، دەسەڵاتدارو بێدەسەڵات، تووشی ئەو هەموو کارەساتو لێقەومانە بووە.

شیعرەکانی شێخ ڕەزا، وەکو شیعرەکانی (ئەبو نەواس)، بەدەنگی بەرز هاوار دەکەن، لەکوێوە هەڵقووڵاونو بەرهەمی کام ئەزموونی ژیانن؟ شوێنەواری خەفەکردنو دامرکاندنەوەی ئاوەژوو یان ئارەزووی پێوە دیارە، یەکێک بیەوێت، فەرهەنگی شیعری شێخ ڕەزا، بەوردی شەنو کەو بکاتو ئەنجامگیری بکات، دەتوانێت ((شوێنپێی وشەکان هەڵبگرێت))، تا نێچیری ڕاستی لەبن ئەشکەوتەکانی ڕەوانبێژی دەدۆزێتەوە. شیعر، وەکو ئامرازێکی دەربڕینو دارشتن، بەشێکی بەرهەمی جیهانی هۆشو ئاگاییو عەقڵو بیرکردنەوەیە، بەشەکەی تری ڕەنگدانەوەی ناڕاستەوخۆی بنهۆشە Unterbewusstsein. زۆرجار منداڵ بێمەبەست بەردێک دەهاوێت، بەپێچەوانەی ویستو ئارەزووی خۆی، هەڵدەگەڕێتەوەو بەردەمو چاوی خۆی دەکەوێتو دەیرووشێنێت. شیعرەکانی شێخ ڕەزا، لەم ڕێسایە بەدەرنین، ئەو ویستویەتی ئازار بە بەرامبەرەکەی بگەیەنێتو بیکاتە گاڵتەو گەمەی خوێنەران، بەڵام ئەم کارو کاردانەوەیە، زیانی بەخۆیشی گەیاندووەو خوێنەر، هەر لەخۆوە هەزارو یەک پرسیاری لەسەر کەسایەتی شاعیر لادروست دەبێت!!

## مەرگی باوکو تەقینەوەی بەنداوی داشۆری

زۆربەی زۆری سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن، کە خالس ساڵی (١٢٧٥ک) بەرامبەر (١٨٥٨-١٨٥٩ز) کۆچی دوایی کردووە. واتە: شاعیر تەمەنی (٢٠) یان (٢١) ساڵ بووە، گوایە شاعیر تا ئەو کاتە، تەنیا شیعری غەزەلو خۆشەویستیو ئیلاهیاتی نووسیووە![٢٧] بەهیچ شێوەیەک نەیویستووە، لەبەر دڵی باوکی، ڕچەی شیعری داشۆری بشکێنێتو باشوورو باکوور، بەشمشێری هاری زمانی، داپڵۆسێنێت، گوایە ئەم (پەپوولە)یە، پاش مەرگی باوکی تووشی ڕاچڵەکاندن (شۆک Shock) بووەو ئیدی سەرجەمی کۆنسێپتی (Concept) ژیانی سەر لەبەریەک هەڵوەشاوەتەوە.

ئەو خەڵکە، هەمووی باوکو دایکیان کۆچی دوایی کردووە، کەس لەشیعری غەزەلەوە بۆ جیهانی داشۆری باینەداوەتەوەو کەس پەلاماری کەسی نەداوە؟

ئەو دوو ساڵی پێش مەرگی باوکی، واتە: (١٢٧٣ک) سەفەری ئەستەموولی کردووەو لەوێ دوو ساڵ ماوەتەوە، کەواتە: بەتەمەنی (١٨) ساڵی کەڵکەڵەی سەفەری پایتەخت کەوتۆتە سەری، کە پتر لە ٢٥٠٠ کم لەکەرکوکەوە دوورەو بەکاروانو بەپێیان ڕۆیشتن هەر زۆر زەحمەتو ناخۆشە، خێزان بەجێهێشتن لەو تەمەنەدا، بەڵگەی پانتایی ئازادییە، کە شاعیر بۆ خۆی بەڕەوای زانیوە، ئەو کاتە تەنیا بۆ مەبەستی خوێندنو کارو کەسابەت نەبووبێت، ئەمجۆرە سەفەرە شتێکی ئاسایی نەبووە، مەبەستی ئەو لەم سەفەرەدا، سیاحەتو گەشتوگوزار بووە (خواستم کە بڕۆم بۆ سەفەری ڕۆم بەسیاحەت) واتە: نە مەبەستی خوێندنو کارو کەسابەت بووەو نە نەخۆشیو کاری ڕەسمی... هتد. ئێمە سەبارەت بە یەکەم سەفەرو سەفەرە ئەفسووناوییەکانی تری شێخ، شتێکی ئەوتۆ نازانین، تا تاریکی دەوروبەری ڕووداوەکانی پێ ڕوونبکەینەوە!

ئەو، دەگەڕێتەوە بۆ کەرکوک، نەمانی باوک، سێبەرێکی گەورە بەسەر ماڵو خێزاندا دەکێشێت، باوک،

ئەگەر تەنیا لایەنی مەعنەویش بێت، ڕووخانی قەڵاو سەرهەڵدانی بۆشایی بووە لەژیانی پڕ جەنجاڵی شاعیر، شێخ عەلی بەگەرمی ئامێزی بۆ ناکاتەوە. ئەو، نابێتە ئەلتەرناتیڤی باوک، خێزانی خۆی پێکەوە ناوەو ڕەنگە ناوەندی سەرنجو بایەخپێدانی شێخ محەمەد عەلی کوڕی بێت. ئەو، لەکاتی مەرگی باوکیدا، تەمەنی نزیکەی (٢٧) ساڵ بووە، شێخ عەلی لەو تەمەنەدا نەیتوانیوە بۆ برای شاعیری دەمهەراشی، چاوکراوەی دنیا دیدە، ببێتە دەمڕاستو باوکو (پەتریارخ Patrisrch). برا بچووک داوای ((ماڵ))و ((ژیوار))[٢٨] ((دیوەخان)) ی کردووە. ڕەنگە لەدڵی خۆیدا حەزی کردبێت، جێگەی باوک بگرێتەوەو کاکی بەشایانی ئیرشادو ڕیشسپێتی نەزانیبێت.

کارەساتەکەی شێخ ڕەزا دەبێتە سێ کارەسات: مردنی باوکی، تێکچوونی ماڵو هێلانە، دژایەتییەکی بەرفراوان لەلایەن خزمانەوە، هیچ هێلانەیەک لەکەرکوک نەیتوانیوە، ئەم تۆپە ئاگراوییە بگرێتە خۆی:

ئەو ڕۆژە کە تۆرام لەکەرکوک سەفەرم کرد
مانەندی عەقارب لەئەقارب حەزەرم کرد
گەردوون سوبوکی کردمو هێنامییە کۆی
میوانی لەکن مامە غەفووری لەجەرم کرد[٢٩]

ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوەی شێخی مەزن، هەر لەگەنجێتییەوە، دڵی خەڵکێکی زۆری لەخۆی ڕەنجاندووەو (ئەقارب) هەموویان (زۆربە)یان لایەنگیری برا گەورەیان کردووە. هەرچەند دەبا، هاوکێشەکە پێچەوانە بێتو چەند کەسێک وەکو ناوبژیکەر، لەبنەوە دڵیان بەو (تلف)ە بسووتایەو نەیانهێشتایە ئاوارەو دەربەدەر بێت.

ئەو، پاش کارەساتی چوارەمو پێنجەم، یان پاش زنجیرە تێکشکانو نسکۆو شەڕی دۆڕاو، لەقەسیدەیەکدا بیری دەکەوێتەوە، کە شێخ عەلی شەڕی لەگەڵدا کردووەو قسەی ناشرینو ناڕەوای پێگوتووە، شیعرەکە ئەوە دەردەخات، دەستپێشخەری بۆ شەڕ، برا بچووک بووبێت، نەک برا گەورە، شێوەی جوێنەکەش ئەوە پیشان دەدات، شاعیر لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە (فونگسیۆن Funktion)ی لاوازو لاوەکی بووە، ئەگینا کاکی نەیدەگوت ((ئەو خوێرییە بێکارە)):

هەرچەندە وتم، وەختێ کە دیم نەخوەتی قەلبی
یارەب کە لەگەڵ (شێخ عەلی) بۆچی شەڕم کرد
هەر دەچمەوە لای گەرچی بڵێ: هاتەوە دیسان
ئەو خوێرییە بێکارە کە من لێرە (دەرم کرد) [٣٠]

ئەم تووڕەبوونو جوێندانەی شێخ عەلی، بەڵگەی ئەوەیە، کەسایەتی ئەو، ئەو کاتە، ئەوەندە بەهێز نەبووە، دەوری ((پەتریارخ)) بۆ برا بچووک ببینێت، هەر یەکسەر پەلاماری کوتەکی دەرکردنی داوەو ڕێگەی نەداوە لەو ناوە بمێنێتەوە، ئەگەر کەسایەتییەکی بەهێزی وەکو خاڵس ببوایە، دەیتوانی دڵی برا گچکە ڕابگرێتو نەهێڵێت دەمی لێی بکرێتەوە.

## سەرەتای داشۆری

ئایا ((کاکە پەپوولە)) بەمەرگی باوکی زمانی داشۆری کراوەتەوە، یان لەسێبەری باوکیا نەیوێراوە، بەڕاشکاوانە، ڕوو هەڵماڵراوانەو بەئاشکرا تاجی شای داشۆری لەسەرنێت؟

پێشتر شایەکی بێتاج بووەو مەرگی باوک، پەردەی شەرمو حەیاو سڵکردنەوەو پرینگانەوەی دڕاندووە؟

هەر کەس هەجوەکەی شێخ غەفووری مامی بخوێنێتەوە، دەزانێت بەشەش مانگو ساڵێک ((گۆڕانکاری بنچینەیی)) ڕوونادات، ئەگەر ئەو کەسە بنەمایەکی ڕووحی نەبێتو بەهرەکەی زۆر باش مشتوماڵ نەکردبێت! ئەم هەجووە، ماوەیەکی زۆر کورت، پاش مەرگی باوکی دایڕشتووە:

شەش مانگە بەم ئەفسانە، گلی دامەوە لای خۆی
نەمزانی ملم بشکێ تیا چووم، زەرەرم کرد

(پەپوولە)یەک، تەنیا شەش مانگ، یان ساڵێک پاش کۆچی دوایی باوکی، بەم شێوەیە بێتە دەست، ئەمە بەرهەمی باوک مردنو دەربەدەربوون نییە، شێوەی جوێنەکان، بەڵگەی دەرچوونن لەفێرگەیەکو هەڵگرتنی بڕوانامەی دکتۆرا، یان پلەی پرۆفیسۆری لەزانستی شەڕەجوێنو داشۆری.

## نامۆبوونی کولتووری دڵساردی لەگەڵ شێخ عەلی

مەبەست لەنامۆبوون، بەئەڵەمانی (Entfremdung) پەیوەندی نزیکو قووڵ، بەرەو ترازانو نەمان بچێت، خۆ بەغەریبو نامۆ دانان، بەرامبەر ژینگەیەک، یان کەسێک، بێتە بەرچاو. شێخ ڕەزا، بەرامبەر شێخ عەلی برای، سەرەڕای ساردبوونەوەی پەیوەندی، بەدزییەوە لەیەکتر خوێندن، گەڕاوەتەوە کەرکوک، دوو گوندی لەباوکیەوە بۆ بەجێماوە ((قرخ))و "تاڵەبان" دووربەدوور، سەرپەرشتی زەویو زاری خۆی دەکات.

شێخ ڕەزا ئەم قەسیدەیە لەسەر پەیوەندی خۆیو کاکی دەنووسێت:

یگانە هەموو صاحبی جاەو جەبەروتن
بێچارە برای (شێخ عەلی) موفلیسو ڕووتن
ئەی (شێخ عەلی) چاکە وثوقت بەبرابێ
باوەڕمەکە بەم خەلقە کەوەک تولە لەدوتن
قەومێ کەلە عەهدی پدەرت حەلقە بەگوش بوون
تەحقیقی بزانە بەخدا جوملە عەدوتن[13]

گومان لەوەدانییە، کاتێک شێخ عەلی، لەم شێوەدا چاوی بەدەستەواژەی (وثوقت بەبرابێ) کەوتووە، یەکسەر بەیتێکی تری قەسیدەیەکی تری شێخ ڕەزای بیرکەوتۆتەوە (وەک سەگی برسی بەحەسرەت سەیری دوگی مەڕیکا)، یەکێک خۆی وەکو (سەگی برسی) بێتە بەرچاو، دەبێ شێخ عەلی چۆن (وثوق)ی پێبکات؟ بەدووری نازانم (شێخ عەلی) گۆرانییەکی لەبابەت گۆرانییەکەی حەسەن زیرەکی بیرنەکەوتبێتەوە:

لەبەر ئەو کچە ڕەشتاڵە
قەدی دەڵێی شمشاڵە
ئەگەر "گولە" لێی پرسیت: "کێیە؟"
رامژێنەو بڵێ: منداڵە

بەحساب "گولە" پیاوێکی زرتە زەلام، بەباوەشێ سمێڵەوە، لەناو بێشکەدا دەبینێتو هەر کچە ڕەشتاڵەکە گوتی: "منداڵە!" ئیدی ئەو هەر یەکسەر بڕوای پێدەکاتو داستانەکە تێدەپەڕێت، مەسەلەی بڕوا بەیەکبوون، بەیەکجاری بۆ ناوەڕاستی خەرەند دەخلیسکێت، من خۆم بەدووری نازانم، گرژیو کێشەی نێوان شێخ عەلیو شێخ ڕەزا کۆنتربێتو برابچووک، پێش مردنی باوکی، دەیان کێشەی بۆ باوکو براگەورە نابێتەوە. بۆیە ڕۆیشتن بۆ "سیاحەت" لەتەمەنی (١٨) ساڵیدا، تۆزێک وەستاوە! دیارە باوکو برا، ئەوەندە وەڕس بوونو ئەوەندە تووشی سەرئێشەو گێچەڵو دەردەسەری بەدەست برابچووکەوە هاتوون، ئیتر هەر خواخوایان بووە، ڕۆژێ زووتر، ملی بشکێنێتو لەبەرچاویان نەمێنێتو بە (سیاحەت.. سیاحەت) نەگەڕێتەوەو ناوی لەناواندا نەمێنێت.

## نامۆبوونی کولتووری، پاش چارەکە سەدەیەک

من هەربەخەملاندن، پێموایە شێخ جارێکی تر، بەچڕترو بەخەستتر، سەرلەنوێ کێشەی کۆن، لەگەڵ شێخ محەمەد عەلی برازای دەتەقێنێتەوە، ئەمجارەیان لەفۆرمێکی جیاوازدا، سەبارەت بەساڵی نووسین، یان گوتنی قەسیدەکە، بەتەقدیر (٢٥) ساڵم داناوە، چونکە شێخ محەمەد عەلی کەڕە، کە کەڕو نیوەزمان بووە، ساڵی (١٢٧٣ ک) بەرامبەر (١٨٥٧ ز) لەدایکبووە، ئەوکاتەی شێخ ڕەزا هەجوی کردووە، بەهیچ شێوەیەک ڕێی تێناچێت، تەمەنی لە (٢٠- ٢٥) ساڵ کەمتر بووبێت. د. مکرم تاڵەبانی، کەدەبێتە کوڕەزای ئەم شێخ

محەمەد عەلییە، جەخت لەسەر ئەوە دەكات، كە خاوەن دیوەخان بووە. زەحمەتە خەڵك لەمەجلیسی پیاوێكدا دانیشێتو گوێ بۆ قسەی بگیرێتو تەمەنی لە (٢٥) ساڵ كەمتر بێت.

ڕووم كردە بەزمی خاسی برازا ئەزیزەكەم
ئەم شەو، بەصەد تەوازوعو ئیخلاصو سەركزی
ڕوانیم لەدرزی قاپییەوە خۆیو تابیعان
دانیشتوون دوو ڕیزە لەدەوری خلەی كەزی
دەتووت تەمێ كرابوو بە مەخصووصی قاپییەوان
خۆی كرد بەنێرە تورك وتی "كیم یلیر سزی؟"
پێم وت منم كەسەكەم مامە شێخ ڕەزام
"تانمزمیسن، خومەییس ئەفەندی، مەگەر بزی؟"
ئەم سەددی بابە بۆ منە ئیزهاری كە تا بڕۆم
یان مەرحەمەت كە حیزە لەسەرما گونم تەزی
ئەمجا بەكوردی هاتە تەكەللم وتی بەڵێ
ئەو شێخە حیلە بازو قوماربازو كەر دزی
وەختێ كە لەم موعامەلە زانیم غەرەز چییە
دەرحاڵ گەڕامە پاشەوە ئەمما بەعاجزی[١٢]

## لێكدانەوەو شیكردنەوەی كۆدەكان

مەعلوومە شێخ عەلی ئەوەندەی ویستوویەتی منداڵەكانی خۆی پێبگەێنێتو بەرەو پێشەوەیان لەناو كۆمەڵدا بەرێتو دەسەڵاتی ئایینیو دونیاییان پتەوتربكات، یەك لەسەدی ئەوەش بایەخی بەبرابچووك نەداوە، برابچووك هەر لەبنەمای كەسایەتیو دەروونییەوە، پێویستی بەئاوڕدانەوەو لەئامێزگرتنی باوك بووە، كە ئەم لایەنەی پڕ نەكردۆتەوە.

شێخ عەلی هەر ئەو بێبەش ناكاتو لەناوەندی ئایینی (تەكیە) پەراوێزی ناخات، بەڵكو بەچاوی خۆی دەبینێت كاكی، كوڕە كەڕو نیوەزمانەكەی، كە بەكەڵكی ئیرشادو گوتار خوێندنەوە نایەت، هەرچەندە نیوتەمەنی شێخ ڕەزای هەیە، دەكرێتە خاوەن دیوەخانو بەئارەزووی خۆی پەخشانو تەخشان دەكات.

ئەمە دیوی ڕاستی پەیوەندی نێوان برا گەورەو برا بچووك/ مامو برازایە. شاعیر، كە پیاوێكی پڕ هەستو دڵ بریندارو بێماڵو بێلانەو بێسەرمایەو بێپلەوپایەیە، دەزانێت، برا گەورە، ئەمی لەپێگەی كۆمەڵایەتیو مادی ڕووتاندۆتەوەو وەكو ڕیشۆڵەیەكی ئاوەڕووتكراوی لێكردووە.

شاعیر، تەنیا هەست بەغەدرو ماف پێشێلكردن ناكات، بەڵكو لەڕووی دەروونییەوە، شورەو دیوارو تەلبەن، لەنێوان هەردوو بەرەكەدا بەرز دەبێتەوە.

مامە شێخ، فەرهەنگو كولتوورو زمانی كوردی دەكاتە چەتر بۆ خۆی، زمانی كوردی، شەقڵی سەرەكی كولتووری خەڵكی ڕەشو ڕووتو گوندیی بووە، بەرامبەر گوندو لادێ، كولتووری شارییو دەوڵەتو دەزگای دادگاو جەندرمە وەستاوە، ئەو سەردەمە لەكەركوك، خەڵكی دەوڵەمەند، دەست ڕۆیشتوو، چینی سەرەوەی كۆمەڵ، گەورە فەرمانبەرە بیرۆكراسییەكانو منەوەران بەتوركی عوسمانی دەدوان، ئەمانە هەر بێزیشیان نەدەهات بەكوردی بدوێن، ئەگەر بەڕەچەڵەك كوردیش بووبن.

شێخ ڕەزا، بەهۆی نامۆ بوونو لێكترازانی ڕوحی، لەنێوان خۆیو براو برازا، ئەگەر ئەوان لەڕاستیدا خۆیان بەئەوپەڕی كوردیش دانابێتو بەلای توركدا قەت دایان نەشكاندبێتو لەسەر ناسنامەی كوردی خۆیان سوور بووبن، بەڵام لەجیهانی فەنتازیادا، شاعیری ((دڵشكاو))و ((ماف زەوتكراو)) ناسنامەی كوردبوون لەبرازا ئازیزەكەی دەسێنێتەوەو دەیكاتە تورك. مەرج نییە ئەو بەتوركی قسەی كردبێت، یان قسەی نەكردبێت، كابرا

کەڕ بێتو لەتە زمانێکی هەبێتو نەتوانێت بەکاری ئیرشاد هەڵبسێت، تورکی لەکوێ فێربوو؟ بێگومان ئەو تورکییەی شێخ ڕەزا زانیویەتی، کەم کەڵە شاعیری تورک زانیویەتی! ئیدی شێخ ڕەزا، لەو بابەتانە بووە، بەگوێرەی میزاجو هەوای ئەو ڕۆژەی، ڕەشی کردۆتە سپیو سپی کردۆتە ڕەش، بەجۆرێکیش ( (ڕووداو))ی دروست کردووە، ڕاستی لەتاریکی ناڕاستیدا بێسەرو شوێن کردووە.

دەتووت تەمێ کرابوو بەمەخصوصی قاپیەوان

خۆی کرد بەنێرە تورک وتی "کیم بلیری سزی؟"

من بەخوێندنەوەی ئەم بەیتە، چیرۆکی "دادگایکردن" ی فرانس کافکام بیردەکەوێتەوە، لەدرزی دەرگاوە، شاعیر دەیەوێت چاوێک بەجیهانی کەیفو نۆشو خۆشی "برازا ئازیزە" کەیدا بگێڕێت، ئەو قاپییەوانی هەیەو ناوی "خومەیس ئەفەندیە" و خۆی لەشاعیر دەکاتە "نێرە تورک" و هەر لەدرزی دەرگاوە، بەرسیڤ ڕەوانەی دەرگالێدەر دەکاتەوە، برازا قاپییەوان دەنێرێتو خۆی ئارەزووی خۆ بزواندنی نییە، واتە: شاعیر بە "تەوازع" و "ئیخلاص" و "سەرکزی" ڕووی کردۆتە بەزمی "خاص"ی تایبەتی برازا ئازیزەکەیو چاوەڕێی کردووە! شاعیر نەبەلووت بەرزیو نە نادڵسۆزیو لەخۆباییبوونەوە، ڕوودەکاتە ئەو، نە داوایەکی پەسەندنەکراو پێشکەش دەکات، ئەو نە دەیەوێت ئاشێک بگێڕێتو نە هەڵایەک بنێتەوە، نە کابرایەکی دووری بیانییە! شاعیر خۆی بۆ نزمترین پلەکانی پەیوەندی نێوان دوو پۆلی نایەکسان داگرتووە. دەرگا، بەداخراوی دەمێنێتەوە، لەبری ئەوەی بەکوردی پرسیاری ئاراستە بکرێت، بەتورکی دەدرێتە بەر پرسیاری نابەڕێزانە:

"کیم بلیری سزی؟" واتە: کێ دەتناسێتەوە؟ با خوێنەرانی ئازیز، ئەم چرکەیە لەشانۆگەریە شیعرییە کورتەکە، بهێننە بەرچاوی خۆیان، پیاوێک مام، کە تەمەنی نزیکەی (٤٤) ساڵە، ڕیشی بەرداوەتەوەو جوببەی لەبەرەو مێزەری سپی لەسەرەو هیچ دیمەنێکی نائاسایی نییە، بە "تەوازع" و "ئیخلاص" و "سەرکزی" ڕوودەکاتە بەزمی خاسی برازا ئازیزەکەی، کەچی ئەو دەرگای لێناکاتەوە، پێشوازی لێناکات! ئەم بەکوردی دەدوێت، ئەو هەر بەتورکی وەڵامی دەداتەوە.

نامۆبوونێکی کولتووری بگاتە ڕادەیەک، مامو برازا یەکتر نەناسنەوە، ئەو کوردەی خۆی کردۆتە نێرە تورک (خومەیس ئەفەندی)، داوای زانیاری بێسەرو بەرو سووکو بێتام دەکات، ئەو لێشاوێک ڕوونکردنەوە بەکوردی دەبەخشێت، ئینجا کە دەبینێت زمانی کوردی ناتوانێت لێکتێگەیشتن بگەێنێت، بە تورکی "بەرتیل" ێکی دەداتێ، ئەوەش سوودێکی ئەوتۆی نابێت.

دەرگاوانو دەستەودایرەی تایبەتی برازا ئازیزەکەی، کە ئەو مەبەستی لێرە ئەوپەڕی دزێوو نائازیزە، لەگەرمەی شادیو کەیفو خۆشینو نایانەوێ شاعیری (بێ کولفەتو ڕەندو، سەیاحو سالووک) بەشداری ئەو مەجلیسە بکات، هەرچی لەدەرگا دەداتو ڕوونکردنەوە بەدوای ڕوونکردنەوەدا لەدرزی دەرگاوە هەڵدەپرژێنێت، کەس دەرگای لێناکاتەوەو بەعاجزی پاشەو پاش دەگەڕێتەوە.

## هەڵوێست بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی

هەڵوێستی شێخ ڕەزای تاڵەبانی بەرامبەر دەسەڵاتی عوسمانی، بریتییە لە پەلکەزێڕینەیەک لەهەڵوێستی جۆراوجۆرو ناکۆکو پێچەوانەی یەکتر: هاوسەنگیو نەگۆڕی، ڕاستو ڕوونو جێگیر بەرچاو ناکەوێت، حاجی قادری کۆیی، یەکێک لەباوکانی بیری ناسیۆنالیستی کوردی، ئەمسەرو ئەوسەری دیوانەکەی شەنو کەو بکەیت، یەک دوودڵی، یەک ستایش بۆ دەسەڵاتی عوسمانی بەدی ناکرێت، لای ئەو دەسەڵاتی عوسمانی داگیرکەرەو گەلی کورد، داگیرکراوەو دەبێ خۆی بۆ شۆڕشو ڕاپەڕینی نەتەوەیی ئامادەبکات...

ئەوەی لەدیوانە بڵاوکراوەکەی شێخ ڕەزا بەرچاو دەکەوێ، فراوانترین پانتایی بۆ پیاهەڵدانو ستایشو مەدحی سوڵتانو گەورە وەزیرو والیو کاربەدەستان داناوە. هەرکەسێک دڵنەوایی نەکردبێتو دیاری جوانی بۆ ڕەوانە نەکردبێتو کارو داواکانی بەرێکو پێکی جێبەجێ نەکردبێت، ئەوە بەر شاڵاوی هێرشو پەلامارو ڕقو جوێنباران کەوتووە.

ئاشکرایە ئەوانەی لەهونەری ستایشو پیاهەڵداندا، کارامەو هونەرمەندن، هەر ڕێک لەبەرگدروو دەچن، کالاَ بەقەد بالاَ دەبڕن! لەهونەری پیاهەڵدانو ستایشدا، ڕاستگۆییو دڵسۆزیو سۆزو ڕاستی، کەمتر لەسەر شەپۆلەکانی دەریای شیعر دەبریسکێنەوە، هونەری ستایش، ئامرازی ڕەخنەو گۆڕانی کۆمەلاَیەتیو سیاسی نییە، بەڵکو ئامرازی وەدەستهێنانی دەستکەوتو قازانجو دەم شیرینکردنە، هەڵسەنگاندنو بەراووردکاریو دۆزینەوەی کەموکووڕی، پەیوەندی لەگەڵ هونەری وەستان، بەبچووکیو سەرکزی، لەبەردەم عەرشی مەزنی سوڵتاندا ناگونجێت، بەمەبەستی خەم ڕەواندنەوەو دڵخۆشکردنو هەستکردن بەشانازیو خۆ بەزلزانین.

سروشتی خاوەن دەسەلاَت وایە، بەتایبەتی ئەوانەی خۆیان لەئاوێنەی مێژوودا زۆر بەمەزنو گرنگ دێتە بەرچاو، ئەوەندەی هۆنینەوەی درۆ، پیاهەڵدانی ناراستو بێبناغە شادو بەختەوەریان دەکات، یەک لەسەدی ئەوە بیستنی قسەی ڕاستو ڕەواو دادپەروەرانە، دڵیان خۆش ناکات! شاعیرێکی عەرەب، هەر زۆر جوان پێکاویەتی:

وقالوا فی الهجاو علیک إثم

ولیس الإثم إلا فی المدیح

لأنی إن مدحت مدحت زورا

وأهجو حین أهجو بالصحیح(٣٣)

شاعیرێکی کورد، سۆزو نیشتمانپەروەریو دڵسۆزی پاڵی نانێت بۆئەوەی لەدەرگای ستایشی سوڵتانی عوسمانی بدات، بۆیە مەدحەکە لەناخی دڵەوە هەڵناقوڵێتو ڕەنگە نەتوانێ بەجوانی هەستو نەستی سوڵتان ببزوێنێت، شاعیری کورد یەک مۆتیڤ هانیداوە، ڕێگەی دوور بگرێتەبەرو "دیاری" نایابی خۆی بەگوێی سوڵتان بگەیێنێت، پاشان بینینی سوڵتان هەروا ئاسان نەبووە، شاعیرێکی گەرمیانی، بەبێ ناسینو (واستە) خۆی بگەیێنێتە سەری سەرەوەی دەسەلاَت.

ئەوە ئێستا لەم سەردەمەدا دەبینین، سوپای لەبن نەهاتووی شاعیرانی پیاهەڵدانو ستایش، دەمیان بەهیچ ترێیەک ناگاتو هەر لەدوورەوە، ئەسپی دیاری وشە ڕەوانەی ئەملاو ئەولا دەکەنو هیچیان پێناگات!

شاعیر، داوایەکی سادەی هەبووە: مووچەیەکی مانگانەی بۆ ببەستن، یان لەزەویو زاری سوڵتان پارچەیەک موڵکی لەسەر تاپۆ بکەن،... هتد. داوایەکی ئەوتۆ بەبێ پارچەیەک ستایشنامە، ڕەنگە لەهیچ شوێنێک، لەکونو قوژبنی جاڵجاڵۆکەیی دەسەلاَتی بیرۆکراسی عوسمانیدا، ڕێگەی تێپەڕبوونی نەدرێت!

شێخ ڕەزا، بەچەند قەسیدەیەکی تورکی عوسمانی، ستایشی سوڵتان عەبدولعەزیز (عبدالعزیز ١٨٣٠ - ١٨٧٦) و هەروەها پیاهەڵدانی ئەوتۆی بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦-١٩٠٩) نووسیووە، مەگەر هەرخۆی توانیبێتی گوڵو گوڵزاری فەنتازیای ئەوتۆ بەسەر دەرباری سوڵتانێکدا ببارێنێت، ئەم مانگی هەنگوینە، لەنێوان سوڵتانو شاعیری کەرکوک، پاش ماوەیەکی نادیار کۆتایی پێدێت، کەمن هەرچەند گەڕام نەمزانی هۆکەی چییە؟ ئایا ستایشو پیاهەڵدانو داواکاری، کە ڕەوانەی (باب العالی) کردووە، کاریگەری نەبووەو هەرهیچی لێ سەوز نەبووە، یان شاعیر هەستی کردووە، ئەستێرەی چارەنووسی ئەم خەلیفەیە بەرەو ئاوابوون دەکشێت؟

کاشی یک روزم بما بین همایون را دهند

تا (حمیدخان) رابگویم: ای (حمیرالمؤمنین)

بعثت تو برخلاف بعثت پیغمبر أست

(أنت ما أرسلت إلا زحمه للعالمین)

**بەکوردی:**

خۆزگە ڕۆژێ ڕێیان ئەدام ئەچوومە دەرگای شاهانە

تا بە (حمید خان) بڵێم ئەی (کەری موسوڵمانان)

ناردنی تۆ بەپێچەوانەی ناردنی پێغەمبەرانە

تۆ تەنیا هەر بۆ ئازاردانی موسوڵمانان نێردراویت(٣٤)

بەشێکی زۆر لەشیعرەکانی شێخ ڕەزا، وەکو زۆربەی شیعری کلاسیکی کوردی، ڕۆژو ساڵیان دیارنییەو کەم جاریش بۆنەو شوێنی دانانی ئەو شیعرە دەزانرێت، ئەم شیعرەی سەرەوەش یەکێکە لەو شیعرانە، کەکۆتایی دەسەڵاتی پاش شۆڕشی مەشروتە، یان هەشتاو نەوەدەکانی سەدەی (١٩) نووسراوە؟

نەزانینی ساڵو ڕۆژو بۆنەو شوێن، کێشەیەکی گەورە بۆ توێژەرو کۆڵیارو نووسەران دەهێنێتە پێشەوە، لایەنێکی تری کێشەکە ئەوەیە، ئێمە ناتوانین سەد لەسەد، لەڕاستیو دروستی دیوانە شیعرییەکان دڵنیابین، ئایا (ناسخ)ەکان بەئەمانەتەوەو پاش دڵنیابوون شیعرەکانیان بڵاوکردۆتەوە، یان سێبەری گومان دەتوانێت چەندین قەسیدەی ناو دیوانەکە بشارێتەوە؟

ئەگەر بەلای کەمەوە، ئەو شیعرانەی دژی موفتی زەهاوی[٣٥] (١٢٠٨-١٣٠٨ ک) بەرامبەر (١٧٩٣-١٨٩٠ ز) و جەمیل صدقی زەهاوی[٣٦] (١٨٦٣-١٩٣٦ ز) ڕاست بنو هیچ گەردی پرسیارو خۆڵەمێشی گومانیان پێوەنەبێت، ئەوە دەبێ خەیاڵمان بۆئەوە بچێ، تەقینەوەی ناکۆکییەکە لەسەردەمی موفتی زەهاوییەوە دەستی پێکردووە! هەرچەندە دەربارەی بیروبۆچوونی سیاسی موحەمەد فەیزی زەهاوی، تائێستا زۆر کەم کارکراوەو ئێمە مێژووی ژیانیشی بەتەواوی نازانین، بۆنموونە: شێخ محەمەدی خاڵو شێخ محەمەد عەلی قەرەداخی هەریەکە کتێبێکیان لەسەر ئەم کەسایەتییە گەورەیە نووسیووە، بەڵام سەبارەت بە بیری سیاسی، شتێکی ئەوتۆ بەرچاو ناکەوێت. یەکێک لەشیعرە تورکی عوسمانییەکانی شێخ ڕەزا، بەئاشکراو بێپەروا، داکۆکی لەبەرەی سەڵتەنەتخوازو دژە ڕیفۆرمو چاکسازی کردووە، بەتوندی هێرش دەکاتە سەر قانوونی بنچینەیی (قانوونی ئەساسی):

بیچارە عدالت کە ییقلمشدی بناسی
بردن ایچنە سیچدی بو قانون اساسی
قانون الهی وار ایکن یعنی شریعت
قانون هژیاندر چەسیاسی چە اساسی

**بەکوردی:**

عەدالەتی بێچارە کە بیناکەی ڕووخابوو
بەیەکجاری گووی تێکرد قانوونی ئەساسی
قانوونی خودایی هەبێت، یانی شەریعەت
قانوون وڕێنەیە، سیاسی بێت یا ئەساسی[٣٧]

ئەوساڵەی سوڵتان عەبدولعەزیز (١٨٧٦ ز) دەکوژرێت، تاوانەکەی دە ئەستۆی ڕیفۆرمستەکان دەخرێتو بەتایبەتی تیشک دەخرێتە سەر مەدحەت پاشا، لەوە دەچێت موفتی زەهاوی یەکێک لەلایەنگرانی والی بەغدا بووبێت، شێخ ڕەزا ئەمە بەهەل دەزانێتو بەتورکی عوسمانی هێرشی دەکاتەسەر:

گرچە علمندن گولایی مفتی بغداد ایش
زوجەسی کرخانەکردن چقمە بر گواد ایمش
قاتل عبدالعزیزخان، مدحت ایلە متفق
فکرینە خدمت ایدوب خائنلرە امداد ایمس

**بەکوردی:**

هەرچەندە لەبەر دانایی مفتی بەغدا بوو
ژنەکەی لەکارخانە دەرچوو، گەوادێک بوو
لەگەڵ (مەدحەت) بکوژی عەبدولعەزیزخان، هاوبیر بوو
خزمەتی بیری ئەوی دەکردو یارمەتی خائینانی ئەدا[٣٨]

ئەگەر ئەم شیعرە ڕاست بێتو دەستکرد (انتحال)[٣٩] نەبێت، لەلایەن یەکێکی وەکو (محمود شکری الألوسی) یەوە، دەبێ شێخ ڕەزا ئەم کاتە لەبەرەی سەڵتەنەتخوازە دژە چاکسازییەکان بووبێت، بیرمان

نەچێتەوە کەسانی وەکو (الألوسی و محمد بهجت الأثری) بەتوندی دژی زەهاوییەکان بوونو ئەوانیش، بەرامبەر هێرشو پەلاماری ئەمان، بێدەنگ نەبوون.

بەگوێرەی هەندێ بەڵگەو کۆدی ناو شیعرەکان، دەتوانین بگەینە دەرهاویشتەیەک کە شێخ ڕەزای پیر، بەپێچەوانەی شێخ ڕەزای گەنجەوە، لەهەڵپەهەڵپی گەشەپێدانی کەرتی پیشەسازی ستایشسازیو سەڵتەنەتخوازی ساردبۆتەوەو لەهەرکوێش بۆی هەڵکەوتبێت، بەپلار بەردبارانی سمبۆلە دزیوەکانی (پیاوە کەنەفتەکە)ی کردووەو بەهیچ شێوەیەک دەستی لێ نەپاراستوون!

یەکەم: میجەرسۆن لەگەشتە نهێنییە ئەفسووناوییەکەی بۆ خوارووی کوردستان لە (ک ٢ ١٩٠٩) لەشاری کەرکوک چاوی بەشێخ ڕەزا دەکەوێت، لەڕۆژی (٢١ ک٢ ١٩١٠) شاعیر کۆچی دوایی کردووە، واتە: نزیکەی ساڵێک پێش مردنی، هەر زۆر بەرامبەر بە تورکو زمانی تورکی توند بووە.

دووەم: ساڵی ١٩٠٥ لەکۆشکی یەلدز، ئەرمەنییەکان هەوڵێکی سەرنەکەوتوویان داوە بۆ تیرۆرکردنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، بەتەقاندنەوەی (دینامێت)، بۆمبەکە پێش گەیشتنی ئەو دەتەقێتەوەو نایکوژێت، شێخ ڕەزا لەم بۆنەیەدا دەڵێت:

نەدییم حکم خدادر (هو یحیی‌و یمیت)

یوقسە مقصودیمیزی خاص ایدردی دینامیت

واتە: بڵێم چی؟ ئەمە فەرمانی خودایە (هەرخۆی دەتژێنێتو دەتمرێنێت) وەگەر نا (دینامێت) مەبەستەکەمانی دەهێنایەدی.

هەرکە ئەودێڕەی وت، ئەمین فەیزی بۆ گاڵتە دەڵێ:

(ئەگەر پاشا ئەمەی گوێ لێ بێت بۆ شوێنی گەلێک دوور، دوورت دەخاتەوە). شێخ یەکسەر دێڕەکەی دەخاتە ئەم قاڵبەوە:

جملەنک حافظی حقدر (هو یحی و یمیت)

پادشەه ظل خدادر اونە نەایلر دینامیت

واتە: پارێزگاری هەمووان هەر خودایە، (خۆی دەتژێنێتو هەر خۆی دەتمرێنێت) پادشا واتە: (سوڵتان) سێبەری خوایە، دینامێت چی لەو دەکات[٤٠].

## شێخ ڕەزاو مێجەرسۆن

مێجەرسۆن ساڵی ١٩٠٩ سەردانێکی کەرکوکو سلێمانیو هەڵەبجەو چەند شوێنێکی تری کوردستانی باشوور دەکات، ئەو ساڵی ١٩١٢ گەشتنامە نهێنیو ئەفسوناوییەکەی خۆی لەلەندەن بڵاودەکاتەوە، لەدوو برگەدا، کە ئاماژە بۆ چاوپێکەوتنو پەیوەندی خۆی لەگەڵ شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا دەکات، هەر زۆر بۆ نووسین لەسەر شێوەی بیرکردنەوەی سیاسی ئەو گرنگە، چونکە ئێمە تا ئەم چرکەیە، ژمارەیەکی کەم بەڵگەی بڵاوکراوەمان دەربارەی بیرو بۆچوونی شاعیر بەدەستەوەیە.

پێویستە، پێشەکی ئەوە بزانرێت، چەند مانگێک پاش شۆڕشی مەشروتە ١٩٠٨ سۆن چاوی بەشاعیر کەوتووە، ئەو هیچ بڕوایەکی بە کودەتاچییەکان نەبووەو هەر پێشتریش بڕوای بەجوڵانەوەی چاکسازیو ڕیفۆرمو قانوونی بنچینەیی نەبووە، چونکە پێیوابووە، ئاوەژووی قانوونی خوایەو دیارە بزاڤی دژە ڕیفۆرمو پرۆپاگەندەی سەڵتەنەتخوازانو پەیوەندییە چڕوپڕو فراوانەکانی لەگەڵ کاربەدەستاندا هەڵوێستی واتوند کردبێت.

یەکەم: سۆن لەپێشەکی کتێبەکەیدا ناوی (شاە عەلی[٤١] هەورامانو شێخ ڕەزای کەرکوکو تایەربەگی جافو محەمەد عەلی بەگی جاف) دەهێنێت، کە نامەیان لەسەر مێژووی کورد بۆ ڕەوانەکردووە.

In the historical portions of the book, in so far as more modern history is concerned,
I have been enabled to give some entirely new matter, for that on Kurdish history was

supplied me in letters received from Shah Ali of Aoraman, Skaikh Reza of Kirkuk, Tahir Beg Jaf, Majid Beg Jaf, Muhammad Ali Beg Jaf, while a great part was communicated during conversations at Halabja and Sulaimania.[42]

ئەم ئاماژەکردنەی سۆن، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شێخ ڕەزا، یەکێک بووە لەشارەزا باوەڕپێکراوەکانی مێژووی گەلی کوردو سۆن سوودی لەزانیارییەکانی بۆ نووسینی گەشتنامەکەی وەرگرتووە، یەکێک لەسەنگییەکانی نووسەرە کلاسیکییە ئۆروپییەکان ئەوەیە، بڵاونەکردنەوەی دەقی نامەکانە لەپاشکۆی کتێبەکانیان، یان گواستنەوەی برگەی وەرگێڕاوو دانانی لەناو دوو کەوانەداو ئاماژەکردن بۆ ناوی نووسەری نامە. هیوادارم نووسەرو ڕووناکبیرانی کورد لەلەندەن جوامێرانە هەوڵی جیدی بۆ دۆزینەوەی ئەو نامانە بدەنو هیچ نەبێ، دەقەکان بە سکانکراوی بڵاوبکەنەوە.

من بەدووری نازانم نامەکان لەئەرشیفێک، یان لەکتێبخانەیەک لەکتێبخانەکانی لەندەن پارێزراوبن، ژنەکەی سۆن تاچەند ساڵێک لەمەوبەر لەژیاندا بوو، چەندین کەس دەناسم پەیوەندییان لەگەڵ بێوەژنەکەی سۆن دا هەبووە.

دووەم: شێخ ڕەزا لەکاتی چاوپێکەوتنەکەدا، ئاگاداری گەشەکردنی ڕووداوەکانی پایتەخت بووە، هەڵوێستی بەرامبەر دەسەڵاتدارانی نوێ، کە پاش شۆڕشی ١٩٠٨ دەسەڵاتیان گرتە دەست، ڕەخنەگرانەو ناڕەزاییبوونە، دیارە لەچاوپێکەوتنێکی وا کورتدا شاعیر ناتوانێت، یان نایەوێت هۆی ڕەخنەو ناڕەزایی بەڕاشکاوی دەربڕێت، سۆنیش بەگشتی، ئەو چەند دێڕەی بەگوێرەی میزاجی خۆی یاداشت کردووە، دەقی قسەکانی بە (ریکۆردەر) تۆمارنەکردووە، تائێمە بتوانین بیروڕای شاعیرو میزاجی شپرزەی نووسەر لەیەک جیابکەینەوە، مرۆڤ دەتوانێت ناکۆکی توندوزەق لە دارشتنەکەی سۆندا بەدی بکات، بەتایبەتی لەوخاڵەی دەڵێت: "سونییەکی دەمارگیرە" و مەسیحییەکانی خۆش ناوێت! لەلایەکی ترەوە دەڵێت: هیچ نکۆڵی لەبینینی ئەوانە نییە کە ئیسلام نین، یان شیعەن، ئەگەر بەوشێوەیە دەمارگیربووایە، نەدەبوو چاوی بەخەڵکی ناموسڵمان بکەوێتو ڕێگەیان بدات پێبخەنە ماڵەکەیەوە.

ئێمە دەمانەوێ خوێنەری ئازیز لەوە ئاگاداربکەینەوە، نووسینەکەی سۆن، بەعەقڵیەتی سەدەیەک لەمەوپێش نووسراوەو ئەو بیروباوەڕی چۆنەو چۆن نییە، ئەوە بیروڕای خۆیەتیو ئێمە وەکو ئەمانەتێکی مێژوویی ڕێگە بەخۆمان نادەین هیچ پیتێک بگۆڕین، یان دەستکاری ناوەڕۆک بکەین، هەرکەس دەیەوێت ڕای سۆن نەزانێت، دەتوانێت ئەم برگەیەی خوارەوە نەخوێنێتەوە:

"لەرێگەی ئۆفیسەکانی هاورێی باڵیۆزم، سەعاتچییەوە، ڕۆژێکیان بردمیان بۆ بینینی ناودارێکی کەرکوک کەناوی ڕەزایە، لەلایەن مسوڵمانەکانەوە بە شێخ ڕەزا ناودەبرێت، فەلەکانیش کە ڕقیان لێیەتی، بەمەلا ڕەزا ناوی دەبەن، کە ناونیشانێکی نزمە.

ئەم بەڕێزو لێهاتووە کەسێتی سەرەکی ئایینی ئەم شوێنەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کە سونییەو لەسونییبوونیشیدا دەمارگیرە، هیچ نکۆڵییەکی نییە لەبینینو ڕێزگرتنی ئەوانەی ئیسلام نین، یان شیعەن، کەمنو سەعاتچی هەردووکمان لەڕیزی شیعەکاندا دانراوین.

شێخ ڕەزا لەخانوویەکی تەنیشت ئەو مزگەوتەدا نیشتەجێ بوو، کە پێشنوێژی تیادا دەکرد، ئەو خانووە یەکێک بوو لەباشترین خانووەکانی کەرکوک، حەوشەکەیو ژوورە زەمینییەکانی بەشێوازی فارسیانە ڕێکخرابوون، چەند دارشاتوویەک دیوارە بەرزە ڕووتەکانیان داپۆشیبوو، شێخ ڕەزا بەتەنیا لەژوورێکی درێژی فەرشرێژکراودا پێشوازی کردین، لەڕاستیدا پایەبەرزێکی زۆر بەڕێز بوو، شوێنەواری عیبادەتکردن لەڕەنگێکی ڕەشدا لەسەر برۆی چەسپابوو کە عەمامە سپیەکەشی ڕووناکی نەدەکردەوە، لەنزیک مەچەکیەوە لەسەر زەوییەکە گرامۆفۆنێک هەبوو، کە لەزوڕناکەیەوە هەرئێستا دەنگێکی ناسازی عەرەبی لەخوێندنی چەند ئایەتێکی قورئان بێدەنگ بوو بوو، بۆ ئەم جۆرە بەکارهێنانە، ئامێری بەدفەڕی ئەوروپی لەبەردەستدایە، هەر کەشێخ بیستی من شیرازیم، دەستبەجێ کەوتە باسکردنی حافزو سەعدیو بەفارسییەکی نایاب (ڕەوان) دەدوا.

پاشان دەستنووسێکی دەرهێناو هەندێ شیعری خۆی خوێندەوە، شێخ ڕەزا بەچوار زمانی تورکیو عەرەبیو فارسیو کوردی شیعری هۆندۆتەوە، بەڵام فارسی لەهەموو ئەوانیتر بەلاوە پەسەند تربوو، شێخ ڕەزا سوکایەتییەکی ڕەوای بەزۆرینەی شیعری تورکی دەکرد، کە تا ئاستێکی زۆر هەمووی لەعەرەبیو فارسی پێکهاتووە.

شێخ ڕەزا بەشێوەیەکی ناخۆش ناڕەزایی لەوپێشکەوتنە دەردەبڕی، کە فەلەکان دەیانکردو هیچ گومانیشی تێدانەبوو، کە ئەو پێشکەوتنەیان لەسایەی ڕژێمی حکومەتی دەستووریدا دەکرد، لەقسەکردندا شێخ ڕەزا چاوەکانی دەبریسکانەوە، هەڵدەچوو، دەمارگیری شاراوە لەناخیدا دەکوڵا، پەرۆش بوو بۆ بینینی ڕژانی خوێنی ئەم بێدینانە، لەگەڵ هاواری بێزاریدا دژی هەستی هەڵچووی تورکمانەکان، سەرزەنشتی موسڵمانو فەلەی وەکو یەک دەکرد، بێپەردەش ڕایگەیاند کە ئارەزوو دەکات ببینێ سەری فەلەکان دیوارەکانی کوختەکە (خانووەکە) بڕازێننەوە، ئەم مەخلوقە، کەهیچی نەبوو بێجگە لە ناوبانگێکی خراپ، کە لەو کارەساتەوە پێی دەبڕا، چەندجارێ هەوڵیداوە فەلەکان هەراسان بکات، بەڵام ئەوان پاراستنی تەواوی خۆیانیان دۆزیوەتەوە، ئەمیش بەبەزیو خۆی دەبینێت، پێشنیارەکانی هەمیشە پشتگوێ دەخرێن، کاتێ هەستی دژبە ئەم خەڵکە بێوەیانە دەوروژێنێت، دامرکاندنەوەی ئەم هەڵچوونەی، کاتی پێویست بۆ خواردنەوەی سێ کوپ چای دەویست، مۆڵەتی ڕۆیشتنمان لێ خواست، بێئەوەی هیچ ڕایەک دەرببڕین سەبارەت بەهەستەکانی[٤٣].

Through the offices of my friend the consular watchmaker, I was taken one day to see a notable of Kirkuk, one Reza, called by the Muslims Shaikh Reza, and by the .Christians, who hate him, Mulla Reza, an inferior title

This worthy is the principal priest of the place, and though a Sunni, and a fanatic at that, has no objection to seeing and being polite to the dissenters of Islam, the Shi>a .among whose ranks both myself and the watchmaker were classed

He inhabited a house adjoining the mosque wherein he officiated, one of the best houses in Kirkuk. His courtyard was laid out in flat beds in the Persian fashion, and a few mulberry trees veiled the bareness of the high walls. He received us in a long room, well carpeted, and was alone. A very reverend seigneur this indeed; the frown of sanctity sat blackly upon this brow, unlightened by his white turban. At his elbow on the floor was a gramophone, from whose trumpet a raucous Arab voice had just ceased to shriek verses of the Quran – to such uses are European abominations adaptable! Hearing that I was from Shiraz, he at once began to quote Hafiz and Sa>di, for he spoke excellent Persian; and then, producing a manuscript book, read some of this own poetry. He versified in four languages – Turkish, Arabic, Persian, and Kurdish; but preferred Persian to all of them, having a just contempt for the majority of Turkish verse, .consisting as it does nearly all of Arab and Persian

He complained bitterly of the progress Christians were making, and doubtless would make under the regime of constitutional government; in speaking, his eyes flashed he grew excited, the latent fanaticism in him boiled, and he longed to see the blood of these infidels spilt. With cries of disgust against the lukewarm sentiments of the Turkomans, he denounced Musulman and Christians alike, and frankly declared that he would like to see the heads of the letter adorning the barrack walls. This creature, who had naught but notoriety to gain from such a catastrophe, has several times attempted to harass the Christians, but they have found sufficient protection, and he sees himself foiled, and his proposals ignored every time he would rouse feeling against these harmless people. It took him the whole time of drinking three cups of tea to exhaust his fury, and we took leave of him, expressing no opinion upon his sentiments [44]

لەم تێکستەی سەرەوەدا، پێویستە تێبینی چەند خاڵێک بکەین:

١ـ شێخ ڕەزا، هەرچەند وا ناوبانگی دەرکردووە، کە شیعرە تورکییەکانی زۆر بەرزن، لێرە، ئەو خۆی، شیعری فارسی بەجوانو پەسەند دەزانێتو شیعری سەعدیو حافزی شیرازی بەدەنگی خۆی بۆ سۆن

دەخوێنێتەوە، هۆکەی ڕەنگە ئەوەبێت، تورکی عوسمانی زمانی ڕەسمی دەوڵەت بووبێتو ئەم بەناچاری فێری بووبێت، دوورنییە لەڕووی ویژدانەوە، هەستی بەجۆرە ئازارێک کردبێت بۆ ئەو هەموو شیعرە ستایشەی، کە بۆ کاربەدەستانی عوسمانی نووسیوویەتی، زمانی فارسی لەکوردییەوە نزیکەو و زمانی حافزو سەعدیو نیزامیو فیردەوسییە، ئەم ڕەنگە بەخۆشییەوە، لەشێخو دەروێشو موریدی کوردستانی ڕۆژهەڵات فارسی فێربووبێت.

٢ـ ئەم تێکستە، ئەو بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە، کە شێخ ڕەزا دیوانێکی دەسنووسی هەبووە، ئەم دیوانە دەسنووسە بێسەرو شوێنە، لەوانەیە دەست یەکێک کەوتبێتو بەهۆی ساتیرەکانەوە لەناوی بردبێت.

٣ـ شێخ ڕەزا گرامافۆنی هەبووەو گوێی لەو قەوانانە گرتووە، کە قورئانیان لەسەر تۆمارکراوە، واتە: شاعیر ئەوەندە دەمارگیری بەرامبەر جیهازێکی دەستکردی ئۆروپی نەبووە، سەیرە! شێخ ڕەزا قورئانی لەبەربووەو گوێی لەقەوانی قورئانیش گرتووە؟

٤ـ باشترین خانووی لەکەرکوک هەبووە، ئەمە دژی بەشێکە لەشیعرەکانی خۆی، کە خۆی بەموفلیسو مەهتوک داناوە!

٥ـ شێخ ڕەزا تا تەمەنی (٧١)ساڵیش تەندروستی باش بوو، لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا، یەکێک بووە لە کەسایەتییە بەڕێزەکانی شار.

## لەنێوان نەتەوەو کولتووری عەشیرەتگەریدا

ئەو پرسیارەی لەسەرەتای ئەم نووسینەدا کراوە، دەمەوێ لەکۆتایی ئەم نووسینەدا وەڵامی بدەمەوە:

ئایا قەسیدەی (لەبیرم دێ...)، دەکرێت بەسەرەتاو پێشەنگی شیعری ناسیۆنالیستی کوردی دابنرێت، یان ئەو (بیری سیاسی) بەئەفسانەو داری بێبەر داناوەو هەر شەیداو پەروانەی بەرژەوەندییە تایبەتو بەرتەسکەکانی خۆی بووەو هەر ڕۆژە لەئاشێکی کردووەو هەر ڕۆژە لەشوێنێکدا ماڵیویەتیەوە؟

ئێمە دەبێ، پێشەکی ڕاستییەک بزانین، شێخ ڕەزاو حاجی قادری کۆیی هەموو ژیانیان لەسێبەری دەسەڵاتێکی کوردیدا بەسەر نەبردووە، شێخ ڕەزا، لەتەمەنی پێنج شەش ساڵیدا (پەرادە parade) ی سەربازیو ڕەسمی بەردەرکی سەرا دەبینێت.

حاجی قادری کۆیی، ئەگەر ساڵی (١٨٢٤ ز) لەدایکبووبێت، ئەوە تەنیا بیستو دوو ساڵێکی کۆتایی میرایەتی بابانی بینیوە، ئەوەش لەشاری کۆیە، نەک لەپایتەخت.

بەراوردکردنێکی خێرای نێوان شیعرە سیاسییەکانی ((سالم))، لەگەڵ شیعرە سیاسییەکانی حاجی قادری کۆییو شێخ ڕەزای تاڵەبانی، جیاوازییەکان لەسەر چەند ئاستێکی هاوکاتیبوونو ناهاوکاتیبوون دەبینرێت.

((سالم)) لەقەسیدە عەسکەرییە سیاسییەکانی، کە لەکەشو هەوای مەلحەمەی کلاسیکی (ملحمە) نزیکی کردۆتەوە، بۆ نموونە: (عەزیز بەگی بابان)و (لێم گەڕێن با گۆشەگیربم..) تراجیدیای ڕووخاندنی میرنشینی بابانو داگیرکردنی هەموو ناوچەکە لەلایەن سوپای عوسمانییەوە، بەشێوەیەکی ورد بەرجەستە دەکات، نووکی قەڵەمەکەی دەبێتە زوومی کامێرایەکی سینەمایی، وێنە درامییە خوێناوییەکانی کارەساتەکە، یەک بەیەک هەڵدەچنێت، ئەو بەچاوی خۆی، ڕووداوە سامناکو دڵتەزێنو سووتێنەرەکە لەنزیکەوە دەبینێت، دوا چرکەکانی کۆتاییهاتن بەمێژووی ((دەسەڵاتی کوردی)) لەبەرچاوی ڕوودەدات، ئەسپی داگیرکەر، سەرجەمی داوودەزگای ئیداریو سەربازیو فەرهەنگیو کۆمەڵایەتی هەڵدەشێلێت، خزم و کەسوکاری شاعیر، زۆربەیان دەکوژرێنو بەدیل دەگیرێنو ئاوارەو دەربەدەر دەکرێن.

عەبدولڕەحمان بەگی ساحیبقران ((سالم))، بۆ خۆی یەکێک بووە لەکەسایەتیەکانی چینی سەرەوەی کۆمەڵ، چارەنووسو ناسنامەی تێکەڵاوی چارەنووسی میرنشینێک بووە. ئەو ناسنامەی خۆی لەگەڵ ناسنامەی بابان جیاناکاتەوە، لەچرکەی کارەساتو هەڵوەرینی پەیکەری مێژوو، دەنگی شاعیر، دەبێتە دەنگی ویژدانی هەژێنراوی میرنشینێک، جگە لەبەشێک لەچینی بازرگانو پیشەگەرو کاسبکاران (بۆرجوازی)، کە ناکۆکیو

بەرژەوەندی جیاوازیان لەگەڵ چینی سەرەوەی کۆمەڵ هەیە، دەنگی سالم، دەنگی کۆتاییپێهاتنی سەردەمو مێژووی دەسەڵاتێکی کوردییە، ئەو هاوارو بەدەنگەوەهاتنەی ئەو بەدەنگ دێت، هیچ کەسێکی تر ئەو ((شانازی))یەی پێنابرێت.

شێخ ڕەزا، لەتەمەنی منداڵیدا، لەناو ڕووباری مێژوودا ناژێت، تەنیا برگەیەکی زۆر کورت، چاوتروکاندنێک، لەمێژووی دوورو درێژی میرایەتی بابان دەبینێت. برگەکە، برگەیەکی تایبەتو شاراوەو دەگمەن نییە، برگەیەکی دەسەڵات نواندنی ڕۆژانەیە: نواندنی شانۆیی سیرمۆنیاو نمایشی سەربازییە، پەرادەی سەربازی (Military. Parade)، کە ڕۆژانە، یان لەبۆنە گرنگەکاندا، لەبەردەم دەرباری میر (بەردەرکی سەرا) دەنوێنرا، نوێنەری چینە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمە، دەهاتن بۆ بینینو ڕەنگە بۆ پیشاندانی دڵسۆزیو پابەندبوونو ملکەچی بەرامبەر پاشا، بەچاوی خۆیان دەسەڵاتی بەرجەستەکراوی میرنشینیان دەبینی:

شاعیر، سێ وێنەی دەسەڵات نواندن، بە وشە دەنەخشێنێتو گرنگی پاشا وەکو ناوەندی دەسەڵات نیشان دەدات:

- لەبەر قاپی سەرا سەفیان دەبەست شێخو مەلاو زاهید
- لەبەر تابووری عەسکەر ڕێ نەبوو بۆ مەجلیسی پاشا
- سەدای مۆزیقەو نەققارە تا ئەیوانی کەیوان بوو

هەر دیمەنێک، شایانی لێکدانەوەیەکی فراوانەو بەڵگەی خۆپیشاندانی دەسەڵاتن، دەنگی مۆزیقە دەگاتە ئەیوانی کەیوان، کە سەدان (کم) دەڕوات، سەربازەکان تیپ تیپ، بەچەکو جلوبەرگی تایبەتەوە، بەبەرچاوی کۆمەڵانی خەڵکدا تێدەپەڕن، دەنگی (مۆزیقەو نەققارە) لەکاتی نمایشی عەسکەرییدا کاریگەری خۆی هەیە، لەچاو ڕۆیشتنی ئاسایی سەربازی، بەبێ ئاوازو مۆسیقا.

هەر کەسێک ئەم تێکستەی شێخ ڕەزا بخوێنێتەوە، هەر یەکسەر تێکستێکی ((نالی)) بیردەکەوێتەوە، کە ئەو لەبن کاریگەرێتی ڕاستەوخۆی ئەو پەرادە سەربازییەدا نووسیوویەتی، کەواتە: برگەی مێژوویی‌و وێنەکە هاوکاتن، بەڵام داڕشتنو مۆتیف جیاوازن:

ئەم طاقمە مومتازە کەوا خاصەیی شاهن
ئاشووبی دڵی مەملەکەتو قەلبی سەپاهن
صەف صەف کە دەوەستن بە نەظر خەططی شوعاعن
حەڵقەکە دەبەستن وەکو خەرمانەیی ماهن (٤٥)

## گرنگی مێژوویی شیعری (لەبیرم دێ..)

ئەگەر قەسیدەکەی (سالم) سەبارەت بەرووخاندنی میرنشینی بابان، بە وشە نەبوایەو بەکامێرای تەلەفزیۆنی بوایە، لەکاتیگۆری (فیلمی دۆکۆمێنتار) دادەنرا! ئەو ڕاستەوخۆ، هەرچی بەچاو بینیویەتی، یان بەرگوێی کەوتووە، هەروەکو پەیامنێرێکی سەربازی بەرەکانی شەڕ، زوومی کامێرا بەناو شەڕگەو هێڵە تێکچڕژاوەکانی پێکدادان، چرکە بەچرکە دەگێڕێت، ڕووداوەکان، هاڵاوی خوێنو ناڵینو بۆسووی بارووتی لێهەڵدەستێت.

تابلۆی هونەریی (لەبیرم دێ..)، دەستی هونەرمەندێک، بەڕەنگو فڵچە نەخشاندوویەتی، ساڵانێکی زۆر، کاتی بینینو کاتی نووسین لەیەک جیادەکاتەوە.

شاعیر دووکات، دوو سەردەم، بەچاوی خۆی دەبینێت: سەردەمی دەسەڵاتی کوردی (ئازادی، سەربەخۆیی، ..) ئەمە کاتی یەکەمی ڕووداوە، کاتی دووەم: سەردەمی لەناوچوونی دەسەڵاتی کوردیو لەدەستچوونی ئازادیو سەربەخۆییە، لەکاتی دووەمدا، وڵات داگیرکراوەو ناسنامە پەپوولەیەکی سەربڕاوە، ئازادیو سەربەخۆیی، لەسێبەری هەلو مەرجی داگیرکراویدا، دەبنە خەونو تراویلکە...

بۆ شاعیر، ئەو زەمانەی بیری دەکەوێتەوە، جۆرێکە لەجۆرەکانی نۆستالگیا nostaligia و ئارەزووی

گەڕانەوە بۆ جیهانی منداڵی، یان ئامانجێکی سیاسی هانی داوە؟

ئایا ئەم شیعرە شیعرێکی ناسیۆنالیستیە وەکو شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی، یان گەڕانەوەیە بۆ کولتووری پێش داگیرکردن؟

ئەم شیعرە خزمەتی کام ((بیر))و ((ئایدۆلۆجیا)) دەکاتو دەتوانرێت لەبازنەی (ریڤیتالیزیشنی کولتووری[٤٦] Kultur – Revitalisation) دابنرێت؟

ئەم شیعرە چەند تایبەتمەندییەکی هەیە، کە لەهیچ قەسیدەیەکی تری شاعیردا بەرچاو ناکەوێت، ئایا لەبن چ کاریگەرییەک، شێخ ڕەزا بۆ باوەشی ئەم بیرەوەرییە گەڕاوەتەوە ؟

(شاعیر هیچ ئاگای لەبیری ناسیۆنالیستی هەبووەو بڕوای بەوە بووە ئەو، سەر بەگەلێکی داگیرکراوە، نیشتمانێک ئازادیو سەربەستی تێدا پێشێل کراوەو چۆن لەبیری ناسیۆنالیستی تێگەیشتووە؟

یەکێک لەتایبەتمەندییەکانی ئەم قەسیدەیە، ئەوەیە، شاعیر سەردەمی پێش داگیرکردنی کوردستانی، بەسەردەمی زێڕینی ئازادیو سەربەخۆیی داناوەو شانازی پێوەکردووە:

لەبیرم دێ سولەیمانی کە دار الملک ی بابان بوو
نە مەحکوومی عەجەم نەسوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو

لەنێوان دوو زلهێزی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، سولەیمانی پایتەخت، ئەوپەڕی سەربەخۆیی خۆی پاراستووە، دوو زلهێزەکە نەیانتوانیوە ئەم دەسەڵاتە کز بکەنەوەو لەقاڵبی بدەن.

عەرەب ئینکاری فەزلی ئێوە ناکەم ئەفزەلن ئەمما
سەڵاحەدین کە دنیای گرت لەزومرەی کوردی بابان بوو

سەڵاحەدینی ئەیوبی، یەکێکە لەپاڵەوانە گەورەکانی جیهانو یەکێکە لەناسراوترین کەسایەتییەکانی کورد لەسەر ئاستی مێژوویی، بەڵام شاعیر، بەگوێرەی پێویستی کێشو سەروا (یجوز للشاعر مالا یجوز لغیره)، ناسنامەی بابان بەسەڵاحەدین دەبەخشێت، نەک لەبەرئەوەی سەڵاحەدین پێویستی بەو ناسنامەیە هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەی بابانو شاعیر پێویستییان بەو ناسنامە پێبەخشینەیە.

شاعیرێکی وەکو ڕەنجووری، یان کوردیو سالم، نەیان دەتوانی بە (چاوی دڵ) بگەڕێنەوە بۆ ئامێزی سەردەمی زێڕینی پێش داگیرکردن، چونکە ئەوان لەو سەردەمەدا ژیاون، کەواتە: شێخ ڕەزا، ئەگەر لەسەردەمی بابان ژیابا، ئەویش وەکو سالمو کوردیو ڕەنجووری، نەیدەتوانی بەم شێوازە بیر بکاتەوە! کاتێک دەسەڵاتەکە نامێنێتو دانیشتوانی پایتەختی میرنشین، بەهەر لایەکدا دەڕۆن (جەندرمەو یۆزباشیو بینباشی،...) لەبەردەمیاندا قوت دەبنەوە، بەزمانێکی جیاواز دەدوێن، ئیدی هەست بەنامۆبوونی کولتووری دەکرێت، ئەم بارودۆخە ڕەنگە یەکێک بێت، لەهۆکانی گەڕانەوە بۆ سەردەمی زێڕینی پێش داگیرکردن.

بایەخدان بەژیانی سیاسیو فەرهەنگیو کۆمەڵایەتی پێش داگیرکردنو گەڕانەوە بۆ بەهەشتی لەدەستدەرچوو، ناچێتە چوارچێوەی شیعری ناسیۆنالیستیەوە، بەڵام دژی بارودۆخی سەپێنراو، کە بەلاتینی پێیدەگوترێت: (شتاتۆس کوئو Status quo). بارودۆخی سەپێنراو، لەبن ڕێژنەی پرسیار دانرا، کەواتە: ئەو بارودۆخە لەلایەن داگیرکەرەوە بەزۆرەملێ سەپێنراوە، ڕووبەڕووی ڕەفزو ناڕەزایی دەبێتەوەو دەتوانرێت، ئەگەر لەڕووی بابەتیەوە objektiv ببینرێت، بەبزاڤێکی کولتووری شۆڕشگێڕ دابنرێت.

ئەم جۆرە شیعرە بەبێ کارتێکردنی (بیری ناسیۆنالیستی) نانووسرێت، ئەو کارتێکردنە ڕاستەوخۆ بێت، یان ناڕاستەوخۆ بێت، دەتوانرێت هەستی پێبکرێت، بەڵام بۆ شاعیر نەچۆتە سەنگەری ناسیۆنالیستەکانەوە وەکو حاجی قادری کۆیی؟

بیرمان نەچێتەوە، شێخ ڕەزا ڕێک وەکو عەنتەرەو فەرەزدەقو حوطیئە شانازی بەهۆزو عەشیرەتەوە کردووە، هەر لەسەر تەعەسسوب بۆ عەشیرەتو تیرەو تایەفە، چەند داشۆرییەکی خەستی نووسیووە: (نموونە: کاکەیی، هەمەوەند، جەباری، داودە)، یان ئەو ستایشەی بۆ جافی نووسیووە، لەلایەکی

ترەوە، ئەو بەشێکی لەشیعرەکانی بۆ دژایەتی (قانوونی ئەساسی) تەرخان کردووەو پەلاماری هەندێ سمبۆلی چاکسازی داوە، شاعیرێک ئەوەندە لایەنگرو پابەندی کولتووری عەشیرەتگەری بێتو لەبەرەی سەڵتەنەتخوازان بێت، ناتوانێت هەروا بەئاسانی قەڵەمبازێک بۆ سەنگەری ناسیۆنالیستی بداتو ببێتە پێشەنگی شیعری نەتەوەییو نیشتمانپەروەری!

گومان لەوەدا نییە، شێخ ڕەزا ماوەیەک لەئەستەمووڵ ژیاوە، ئەستەمووڵی ئەو زەمانەش مەڵبەندی بیروباوەڕی ((ئازادی))و ((ڕۆشنگەری))و ((چاکسازی))و ((ناسیۆنالیستی)) بووە، یەکێکی وەکو حاجی قادری کۆیی، پاش ماوەیەکی زۆر کورت، لەژیانی ناو ئەستەمووڵ، دەبێتە ئاڵا هەڵگری بیروباوەڕی ڕۆشنگەریو نەتەوەیی. حاجی قادری کۆیی، تەنگو چەڵەمەی ژیانو گوشارو تەنگ پێهەڵچنین، ناچاری دەکەن ڕووبکاتە ئەستەمووڵ، شێخ ڕەزا بۆ ((سیاحەت))و گەشتیاریو بینینی پایەتەخت، کەرکوک جێدێڵێت، لەوە دەچێت، بەهۆی سەڵتەنەتخوازیو ڕقهەستان لەبزوتنەوەی چاکسازیو ڕیفۆرم، لەکەسانی ئازادیخوازو پێشکەوتنخواز کەمتر نزیک کەوتبێتەوەو هەر خەمی دەرباری سوڵتانو میوانی کاربەدەستو گەورە پیاوان بووبێت.

وێڕای بەرهەڵست، لەبەردەم کردنەوەی پەنجەرەی بیری ناسیۆنالیستی، بەڵام دوور نییە، لەکەلێنێکەوە ئاگاداری ڕاپەڕینو هەڵسانەوەی گەلانی بولغاریاو یۆنان بووبێت! بەدووریشی نازانم، ئەو کاتانەی بایداوەتەوە بۆ هەجوی سوڵتان، سەردەمی منداڵی لە دار الملک ی بابان بیرکەوتۆتەوەو ناسنامەی کورد بوون لای بەهێزتر بووە.

لەبیرم دێ سولەیمانی کە دار الملک ی بابان بوو
نە مەحکوومی عەجەم نەسوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو
لەبەر قاپی سەرا سەفیان دەبەست شێخو مەلاو زاهید
مەتافی کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت گردی سەیوان بوو
لەبەر تابووری عەسکەر ڕێ نەبوو بۆ مەجلیسی پاشا
سەدای مۆزیقەو نەققارە تا ئەیوانی کەیوان بوو
دریغ بۆ ئەو زەمانە ئەو دەمە ئەو عەسرە ئەو ڕۆژە
کە مەیدانی جریدبازی لەدەوری کانی ئاسکان بوو
بەزەربی حەملەیە بەغدای تەسخیر کردو تێی هەڵدا
سولەیمانی زەمان ڕاستت دەوێ باوکی سولەیمان بوو
عەرەب ئینکاری فەزلی ئێوە ناکەم ئەفزەلن ئەمما
سەلاحەدین کە دنیای گرت لەزومرەی کوردی بابان بوو
عوموومی شەهر یاران و سەلاتینی فەرەنگستان
لەرەوعبی سەتوەتی ئەشێرەدا گشتی هەراسان بوو
قوبوری پڕ لەنووری ئالی بابان پڕ لە ڕەحمەت بێ
کە بارانی کەفی ئیحسانیان وەک هەوری نیسان بوو
کە عەبدوڵڵا پاشا لەشکری والیی سنەی شڕ کرد
ڕەزا ئەو وەختە عومری پێنجو شەش طفلی دەبستان بوو(٤٧)

شێخ ڕەزای تاڵەبانی

## سەرنج و سەرچاوە:

١. د. مکرم تاڵەبانی: شێخ ڕەزای تاڵەبانی، دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠١.

٢. د. نوری تاڵەبانی: گەشتێکی تر بەجیهانی شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا، لەگۆڤاری کاروان، هەولێر، ژمارە (٧٠)، ک١، ١٩٨٨.

٣. شێخ ڕەزا، پیاوێکی گورجو گۆڵو چالاک بووە، گومان لەوەدا نییە، کە نامەیەکی زۆری نووسیووە، بەداخەوە دەنگوباسی هیچیمان پێنەگەیشتووەو نەمانبیستووە، لەشوێنێک پارێزراو بن، یان بڵاوکرابێتنەوە. مێجەرسۆن ئاماژە بۆ نامەیەکی دەکات، لەوەناچێت ئەو نامەیەش مابێت، ئەگینا ژنەکەی، کە تا ئەم ماوەیە مابوو، لەشوێنێک باسی دەکرد.

٤. زۆربەی سەرچاوەکان ئەوە باس دەکەن، کە شێخ ڕەزا تاقەتی ئەوەی نەبووە شیعرەکانی خۆی کۆبکاتەوە، یەکێکی وەکو عەبدوللەتیف ثنیان، کە لەنزیکەوە شێخ ڕەزای ناسیوە، بەبۆنەی کۆچی دوایی شێخ ڕەزاوە ١٩١٠/١/٢١ لەڕۆژنامەی (الرقیب) دەنووسێت، گوایە ئەو وتویەتی (دیوانە صدور الرجال لا بطون الدفاتر) کەچی مێجەرسۆن بەڕوونی ئاماژەی بۆئەوە کردووە، کە دەسنووسێکی هەبووەو شیعرێکی فارسی لەو دەفتەرەدا خوێندۆتەوە.

٥. ئەمین فەیزی بەگ: ئەنجومەنی ئەدیبان، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق، بەغدا ١٩٨٣، ل٢٨.

٦. ئەحمەد تاقانە: شاعیرانی کوردستانی باشوور، لەکتێبی (صوک وعصر تورک شاعرلری) نووسینی: ئیبنولئەمین مەحموود کەمال (ئینال). وەرگێڕان لەتورکییەوە، چ ئارپاخا کەرکوک ٢٠٠٦، ل ٥٣، لەهەر شوێنێک باسی ئەم سەرچاوەیە هات، من تەنیا ناوی ئەحمەد تاقانە/ ئینال (س. پ) دەنووسم.

٧. د. مکرم الطالبانی: الشیخ عبدالرحمن الطالبانی، الجزء١، ط١، مطبعە خاک السلیمانیە ٢٠٠٣، ص١١.

٨. مەلا عبدالکریمی مدرس: دیوانی مەولەوی، بەغدا، ١٩٦١، پێشەکی ک.

٩. شێخ محەمەدی خاڵو ئومێد ئاشنا: دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠٣ن ل٢٥.

١٠. بۆ ساغکردنەوەی ساڵی لەدایکبوونی شێخ ڕەزاو براکانی، سەیری سەرچاوەکانم هەموو کردووەو لەخەڵکی وەکو د. مکرم تاڵەبانی پرسیارم کردووە. ئەگەر شێخ عەلی (١٢٤٨ک) بەرامبەر (١٨٣٢ز) لەدایکبووبێتو شێخ ڕەزا (١٢٥٤ک) بەرامبەر (١٨٣٨ز) کەواتە: دەبێ شێخ واحید (١٨٣٦ز) لەدایکبووبێت.. هتد.

١١. دانیشتنێک لەگەڵ د. مکرم تاڵەبانی سلێمانی ڕۆژی ٢٠٠٩/١/٢٣ بەراورد لەگەڵ د. مکرم تاڵەبانی: شێخ ڕەزای تاڵەبانی (س. پ) ل٢٦، کاک ئەحمەد تاقانە زۆربەی سەرچاوەکانی بەسەر کردۆتەوە، کە لەسەر ساڵی لەدایکبوونی شاعیر نووسیویانە بڕوانە: ئەحمەد تاقانە: شێخ ڕەزای تاڵەبانی، کەڵەشاعیری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست. دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس چ١، هەولێر ١٩٩٩، ل٢٨.

١٢. علی الطالبانی: دیوانی شیخ رضای طالەبانی، بەغدا ١٩٤٦ ل٣٥.

١٣. مەبەست لەسۆسیالیزاتسیۆن، یان سۆسیالیزەیشن Socialization سەرجەمی پرۆسەی پەروەردەکردنی منداڵە.

١٤. مەسعوود محەمەد: کەیفی جوانرۆیی، لەدەفتەری کوردەواری، ب٢، بەغدا، مارت نیسانی ١٩٧٠ ل١٩.

١٥. دانیشتنێک لەگەڵ (.....) شاری کوێلن ئەڵەمانیا ١٩٩٤/٤/١٤.

١٦. دانیشتنێک لەگەڵ د. مکرم تاڵەبانی ٢٠٠٩/١/٢٣.

١٧. مەلا عبدالکریمی مدرس: دیوانی مەولەوی (س. پ) ل ک.

١٨. شێخ محەمەدی خاڵو ئومێد ئاشنا: (س. پ) ل ١٣٠، لەبەیتی دووەمدا، یەکەم وشەم گۆڕیوە، چونکە دڵنیابووم، کە (ناسخ)ەکانو مامۆستا خاڵو ئومێد ئاشنا لەبەرئەوەی خەڵکی گەرمیان نین، نەیانزانیوە وشەی (تابکوکی) هەڵەیەو هیچ واتایەکی نییە!

١٩. د. مکرم تاڵەبانی: شێخ ڕەزای تاڵەبانی (س. پ) ل٥٠.

٢٠. سەبارەت بەکەسایەتی (حەمەی وەستا فەتاح) کە شێخ ڕەزا بەکوردی دووجار ناوی لەدەفتەری نەمریدا تۆمار کردووە، ئێمە هیچ شتێکی ئەوتۆ نازانین، ئەو کابرایە، بەگوێرەی تابلۆ هونەرییەکەی شاعیر، هەر زۆر لە ڕاسپۆتین دەچێت، ئەم گوایە لێپرسراوی خواردنو ژیواری تەکیە بووەو جێگەی بڕوای شێخ عەلی بووە، من زۆر کەسم لەژیاندا بینیوە، کە بەهۆی کەسێکی ترەوە تووشی ئاوارەییو دەربەدەری بوون، بەبەردەوامی شیعرەکەی شێخ ڕەزایان دووبارە کردۆتەوە بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: شێخ محەمەدی خاڵو ئومێد ئاشنا: (س. پ) ل٢٠.

٢١. هێمن: تاریکو ڕوون، گوڵبژێرێک لەشیعرەکانی هێمن، بەغدا ١٩٧٥، پێشەکی ل٥.

٢٢. ڕستەی ناو کەوانە لەسەر کێشی (فرهنگ اشعار حافظ) داناوە.

- نووسەرەکەی د. احمد علی رجایی بخارایی چ٤، انتشارات علمی تهران ١٣٦٤ دەیان شاعیری ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژاوایی، لەسۆنگەی کۆنی تێکستەکان، یان گرنگییان فەرهەنگی تایبەتییان بۆ دانراوە: فردەوسی، جەلال الدین ڕومی، شکسپیر، گوێتە.. هتد.

٢٣. کتێبێکی تایبەت لەسەر شیعرە ئیرۆتیکیو ساتیرەکانی گوێتە هەیە، بەڵام ئەمانە ١٪ی شێخ ڕەزا شەڕە جوێنو

داشۆریو ئیرۆتیکی تێدا بەدی ناکرێت: بۆ بەراوردکردن بڕوانە:
.ff S. ٢٢ Goethe: Erotische Gedichte, insel taschenbuch. Leipzig ١٩٩١

٢٤. علی الطالبانی: (س. پ) ل٥.

٢٥. K. R. Eissler: Goethe, eine psychoanalytische studie. Ãbersetzt von Peter Fischer. H. Ràdiger Scholz, stromfeld/ Roter Stern Auflage ٤, Franfurt am Main ١٩٨٤.

ئەم کارەی ئایسلەر، کەمتر لە ١٨٠٠ لاپەڕە نییە، تەنیا لەسەر ساڵانی ١٧٧٥ ١٧٨٥ واتە (١١) ساڵ لەژیانی گوێتە.

٢٦. خلیل شرف الدین: ابو نواس. دار ومکتبە الهلال بیروت ١٩٩٢، ٦٢×.

٢٧. بڕوانە: مەسعوود محەمەد (س. پ) ل ٣٣ د. مکرم تاڵەبانی (س. پ) ل ٢٧، د. نووری تاڵەبانی (س. پ) ل ٢١.

٢٨. ژیوار: ناوی گوندێکە لەهەورامان. بەواتای بژێویش دێ. ئەم زانیاریەم لە کاک محەمەدی مەلا کەریم وەرگرتووەو ناوی کوڕە گەورەکەی (ژیوار)ە.

٢٩. ئەحمەد تاقانە: شێخ ڕەزای تاڵەبانی (س. پ) ل٤١.

٣٠. ئەحمەد تاقانە: شێخ ڕەزای تاڵەبانی (س. پ) ل٤٠.

٣١. علی الطالبانی: دیوانی شیخ رضای طالەبانی (س. پ) ل٣١.

٣٢. د. مکرم تاڵەبانی: شێخ ڕەزای تاڵەبانی (س. پ) ل٥٠.

٣٣. هادی العلوی: الأعمال الکاملة (٩) دیوان الهجاء، دار المدی، بیروت ٢٠٠٣ ص٥.

٣٤. د. مکرم تاڵەبانی: (س. س) ل ٣١٥.

٣٥. سەرەتا پەیوەندی شێخ ڕەزاو موفتی زەهاوی زۆر باش بووەو لە دوو بەیتدا (یان چوار خشتەکیەک)دا ستایشی کردووە:

ئەی مادەری گێتی تۆ هەتا ئێستە نەزاوی
زاتێکی وەکو موفتی ئەفەندی زەهاوی

بەیتی دووەم:

مومکین نییە ئیدراکی حەقائیق بەتەواوی
مومکین نییە ئیدراکی نەکا زیهنی زەهاوی

٣٦. الدکتور علی الوردی: لمحات اجتماعیة من تاریخ العراق الحدیث. مکتبة الحیدریة، ج٣، ٧٢×.

٣٧. د. مکرم تاڵەبانی: (س. س) ل ٣٨٠.

٣٨. د. مکرم تاڵەبانی: (س. س) ل ٣٧٨.

٣٩. محمد علی القرداغی: محمد فیضي الزهاوی، نبذە عن حیاتە وشيء من آثارە، دار آراس للطباعە والنشر، اربیل ٢٠٠٤، ص١٩١.

٤٠ ئەحمەد تاقانە: ئینال (س. پ) ل٥٨و پەراوێزی ٩٣و ٩٤.

٤١ـ مەلا جەمیلی ڕۆژ بەیانی بەرامبەر ناوی (شاە عەلی هەورامان) شێخ عەلی حوسامەدینی نەقشبەندی داناوە، ڕستەکە بەعەرەبی نووسراوە، ئیدی نازانرێ کێ پێیوایە شاە عەلیو شێخ عەلی یەک کەسن، من سەیری وەرگێڕانەکەی فوئاد جەمیلم کرد، ئەو هیچ تێبینییەکی نەنووسیووە:

بڕوانە: محەمەد جمیل ڕۆژبیانی: چاوخشاندنێ بەچاپی تازەی دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا، لە: دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، کۆکردنەوەو لێکدانەوەی شێخ محەمەدی خاڵ، ئامادەکردن بۆ چاپ ئومێد ئاشنا. سلێمانی ٢٠٠٣ ل ١٦٨.

بڕوانە: میجرسون: رحلة متنکرة الی بلاد مابین النهرین وکردستان، ترجمە فؤاد جمیل، ج١ (مکان الطبع: بلا) ١٩٧٠ ص٩.

٤٢ – Soane, Ely Banister:
TO MESOPOTAMLA AND KURDISTAN
P.V IN DISGUISE, Elibron Classics Landan (١٩١٢) ٢٠٠٥

٤٣ـ مامۆستا عەتا قەرەداخی ئەم تێکستەی خوارەوەی کردۆتە کوردی جێگەی سوپاسە

٤٤ـ oOANE, Ely Banister (ibid) P. ١٣٤ ١٣٥ –

٤٥ـ مەلا عبدالکریمی مدرس: دیوانی نالی، بەغدا ١٩٧٦ انتشارات صلاح الدین، تهران ١٣٤٦ ل٣٤٠.

٤٦ـ Tibi, Bassam: vom Gottesreich
, zum Nationalstaat, Suhrkamp
s. ٥٢ Frankfurt am Main ١٩٨٧

٤٧ـ شێخ محەمەدی خاڵو ئومێد ئاشنا: (س . پ) ل٨١.